# هەندێ ووتارو چاوپێکەوتنی وێژەیی

خالید دلێر ١٩٨٥

# هەندێ ووتارو
# چاوپێکەوتنی وێژەیی

بەشی یەکەم

خالید دلێر

١٩٨٥

---

لە چاپخانەی ( الحوادث ) لە بەغدا لەچاپدراوە

# پێشکەش بە

**ئامینەی کچی ئەمین چاوشینی کوڕی مستەفای یاسینی بێ**

— لە شاری کۆیە لە دایك بوو بوو ، تەمەنی بە لێکدانەوەی من لە دەور و بەری چل ساڵ دا بوو •

— ئافرەتێکی هێمن و لەسەر خۆ و خۆڕاگر و دڵ پاك و سادە و مشوور خۆزی ژیانی ماڵ و منداڵی خۆی‌و کەی بانووی چاك بوو •

— هەموو سەردەمی ژیانی لە کوێرەوەری‌دا بە سەر برد بوو مردنەکەشی هەر بە ئازار و ئەشکەنجە گەیشتەکام •

— تا ئەمڕۆ ، وەك سەربازێکی نەناسراو ، ژنێکی باش و خزمەت گوزار و بێ ناوە •

— ئەمڕۆ ، هەر بە ڕێکەوت ، ئەم کتێبەلە بیرەوەری ۲۹ ساڵ تێپەڕ بوون بە سەر کۆچی دوایی ئەودا (٥/ی/حوزەیرانی/١٩٥٥) نووسینەوەی تەواو بوو •

— ئەو ئافرەتە دایکی من بوو •

— ئەمەکی دایکایەتی و پیرۆزی و خزمەت گوزاری خۆی و

خۆشەویستی‌ی بێ سنووری بۆمن ، ڕێکەوتەکەشیان لەگەڵدابێ
هەموو ئەمانە بەسەرم دا دەسەپێنن کە پێشکەش کردنی ئەم کتێبە
وەك دیاری‌یەکی بچکۆلانە ، لە جگەرگۆشەکەی خۆیەوە ، کە
هەتا هەتایێ خۆی بە قەرزاری ئەو دایکە دەزانێ ، تەنیا حەڵاڵ و
زەلاڵی ئەوبێ ، وەك ئەو شیرە پاك و حەڵاڵەی کە داویەتی پێم •
لەگەڵ دوو دڵۆپ فرمێسکی ڕێزلێنانیشدا •

— هەڵبەت خوێندەواری بەڕێزیش ئەم ڕاستی‌یە لەبەرچاودەگرن کە
ئەوی دڵسۆزی بۆ دایکێکی وەها نەبێ ، بۆ کورد و کوردستان و
بۆ هیچ مەسەلەیەك و بۆ هیچ کەسی دیکەشی‌ی نابێ •

**سلێمانی ـ ٥ی حوزەیرانی ـ ١٩٨٤**

# « سەرەتا »

نەتەوەکەی ئێمە ، بە تایبەتی چینە نەدارەکانی ، زۆر شتی چاك و پێناسی مرۆڤانەی تێدایە • یەك لەوانە ، بە ئەمەکی و بە چاکە زانینێکی قووڵە • هۆی ئەمەش بەشێکی زۆری بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە زۆر چەوسێنراوەتەوەو زیاتریش ئازار دراوە • هەر ئاغا ، بەگ ، شێخ، سەردار ، یان هەر لایەکی‌دیی ، ڕاست بووەتەوە ، کێشاویەتی بە تەوقی سەری‌دا و ئەوەندە لە هۆیەکانی ئەو بارە نا سروشتی‌یە پرسیاری لە خۆی کردوە ، بۆ بەم جۆرە مامەڵەم لەگەڵدا دەکەن ؟ تاوانم چی‌یە ؟ وە ئەوەندەش بۆ دۆزینەوەی چارەسەری گەڕاوە و بیری کردۆتەوە ـ جا لەم هەوڵ دانو بیرکردنەوانە دا تا چ ڕادەیەك گەیشتووەتە مەبەست یان نا ئەوە ، جێگەی ئێرە نی‌یە ـ مرۆڤی بیر کەرەوەش هەستی وورد و ناسك دەبێ ـ بەم جۆرە ، هەستی مرۆیانەی نەتەوەکەمان ـ مەبەستم چەوساوەکانە ـ بە ڕادەیەك ناسك و سرك و هەستیار بووە ، کە بچووکترین چاکەی لە یەکێك دیبێ ، بە لایەوە کردارێکی زۆر گەورە بووە و پێی زانیوە و دوو چەندانە و چەند چەندانە گەورەی کردۆتەوە ئەمە بە پێی ئەو ڕاستی‌یە کە زور جار شتی باش و خۆش بە زۆر دیتن و چەشتنی شتەخراپ و ناخۆشەکەی پێچەوانەیەوە دەزانرێ یان هەستی پێ دەکرێ • وەك یەکێ کە تاریکی زۆر دیبێ نرخی ڕووناکی لە یەکێکی دیی باشتر دەزانێ ••• و هتد •

لەگەڵ ئەمەشدا ، دیاردەی درەنگ بە خۆ کەوتنیش هەیە بۆ چاکە و پاداشت دانەوەی • ئەمیش هەر بە هۆی زۆر چەشتنی تاڵی و سوێری چەوساندنەوە و ستەم لێ کردن و سەر لێ شێواندنیەوە ، یان بە هۆی نەبوونی و دەست نەڕۆیشتنەوە کە ئەمیش بەری تاڵی هەمان درەختی نا ڕەسەنە • بە هۆی تێدا بڵاوبوونەوەی گیانی گوێ پێ نەدان و پشت بە ڕۆژگار بەستن و بەرەڵلایی و ناڕێکی و شێواوی لانەکانی ژیانی و پاشماوەکانی دیکەی خووڕەووشت و پێناسەکانی ژیانی جووتیاری و ڕژێمی دەرەبەگایەتی‌یەوە • زۆر جار لە پاش تێپەڕبوونی هەل و مەرج و دەرفەتی گونجاو ، ئەوجا دەکەوێتە خۆیەوە و کە ئەو کاتەش هەلێکە لە دەست‌چووە و تازە بە پەنجە بۆ کرۆشتن و دەست لە دەست دان نایێتەوە •

بە لەبەرچاوگرتنی ئەم دوو دیاردەیەی سەرەوە ، دەگەینە ئەو ڕاستی‌یە کە نەتەوەکەمان ، زۆر ، وە زوو هەست بە کردەوە و بەرهەمی باشی پیاو چاك و زانا و شاعیر و بوێر و هونەرمەندەکانی دەکا ، بەڵام درەنگ دەکەوێتە خۆی بۆ چاکە و پاداشت دانەوەیان • زۆربەی زۆری ئەو ڕۆڵە هەڵکەوتووانە ، هەتا لە ژیاندا ماون ، لە کوێرەوەری و نەبوونی و پەرێشانی‌دا دەتلێنەوە و سەر دەنێنەوە • لە پاش کۆچ کردنیان دا ئەوجا خەڵك دەکەونە کۆکردنەوەی بەرهەمەکانیان و ڕێز لێ نانیان • لەبەرچاومانە کە مامەڵە کردن لەگەڵ بە دەیان شاعیر و هونەرمەندی گەلەکەماندا ، بەڵگەی ڕاستی‌ی ، ئەم بۆ چوونەن کە بەر لە من خەڵکی دیش نووسیویانە و گوتوویانە •

بێ گومان هەتا زووتر و زیاتر ئەم باری چەوساندنەوە و لق و چڵە زەهراوی‌یەکانی کە لەگەڵیدان ، لەسەر نەتەوەکەمان سووك بێ‌و

زیاتر ڕووناکی زانست و بیروباوەڕی پێشکەوتن خوازی بگەنە ناوچـە جیا جیا کانی کوردستانەوە ، خووە چاکەکان لەناویاندا باشتر دەچەسپێن و پەرە دەستێنن و خووەکانی کەم و کوڕی دەنوێنن خێراتر لە ناو دەچن و نامێنن •

ئەم ڕاستی‌یە بۆ ئەوە نا خەمە بەرچاو کـە وەها لێك بدرێتەوە کە من مەبەستم ئەوەبێ هـەتا لە ژیانم دا مـاوم یارمەتی بدرێم و لەم جۆرە لێکدانەوە نا ڕاستانە • چونکە خەڵك لە ژیانی تایبەتی خۆیاندا کـە ئیش بۆ خۆیان دەکـەن من ئەمـە بە یارمەتی دانی خۆم دەزمێرم کە یارمەتی منی پێ دەدەن • دوای ئەوە مـن خۆم بە بوودەڵە تر دەزانم لەوە کە بە هۆی ئەو ڕاستی‌یەی لەســەرەوە ڕوونم کردەوە ، خـــەڵك جێ و ڕێ‌یەکیان بۆداناوم‌کە بەپێی ئەوڕێ‌و شوێنە شایانی یارمەتی‌دان بم‌و لەم ڕووەوە من قەرزاری گەلەکەمانم •

ئەو ڕاستی‌یە بۆ دوو مەبەست دەخەمە بەر چاو • یەکێکیان ئەوەیە کە ڕێـگەی کۆکردنەوە و پێداچوونەوەم بە هەندێ لە بلاوکراوەکانم و چـاپ کردنیان بەم شێوەیەی کـە لەبەردەستان دایە ، بۆ پاك بـکاتەوە • چونکە هەر وەك ووتم من خۆم لـە ناو کۆمەڵدا وەك ئەوە دەبینم کـــە کەمێك لەمەوبەر ڕوونم کردەوە •بۆیە ویستم خۆم ووتار و نووسینەکانم کۆ بکەمەوە و بلاویان بکەمەوە ئەم ئەرکە بۆ دوا ڕۆژ بۆ ڕۆڵەکـانی نەتەوەکەمان بەجێ نەهێلم ، بەتایبەتیش کـە بە ناچـاری ئەرکێکی زۆر گەورەی دیکەیان بۆ بەجێ دیلم کـــە ئەویش ئاگاداری کردنە لـــە (باڵە)(*)ی کوڕم • ئەو منداڵەی کە سروشت هەموو ئازایەتی‌و بە توانایی

---

★ بڕوانە هۆنراوەی ( باڵە ) ـ گۆڤاری بـەیان ژمـارە (٧٦) مانـگی کانوونی دووەمی ١٩٨٢ •

خۆی بە سەر ئەم و هاو چەشنەکانی ئەو دا نوواندوە • چەندی لە توانام دا هەبێ هەوڵ دەدەم هیچ ئەرکێکی دی نە خەمە ئەستۆیانەوە • دووەمیشیان ئەمەیە :ـ

ئەوانەی نرخی وێژەی شۆڕشگێڕ و پێشکەوتن خواز بزانن و شتێکی لێ شارەزابن و پێوەندی یە بە هێز و پتەو و لە پسان نەهاتووەکەی نێوان کۆمەڵانی خەڵك و ئەو وێژەوانە بزانن کە خۆی بە لای کۆمەڵانی خەڵك دا ساغ کردۆتەوە و ئەو ڕێبازەی گرتۆتەبەر ، دەزانن کە بوونی متمانە و پشت بە یەکتری بەستنی ئەم دوو لایەنە چەند گرنگ و بنەڕەتی یە بۆ هەر دوو لایەکە •

ئەوەی شتێك لە نووسینەکانی منی خوێندبێتەوە ، بۆی دەرکەوتووە کە متمانە و پشت ئەستووری من بە جەماوەری نەتەوەکمان و بەر چاو ڕوونیم بۆ دوا ڕۆژی پڕ لە سەرکەوتن و بەختیاری ئەوەندە بەهێز و قایم و بێ سنوورە ، کە پێویست نابینم هیچی دیکەی لەسەر بنووسم و لێی بدوێم • وا بزانم هەر ڕوون کردنەوەی ئەم مەبەستە لێرەدا و بەم شێوەیە ، بەڵگەیەکی بەتین بێ بۆ ئەم ڕاستی یە • بەڵام متمانەی گەلەکەشم ، یان ئەو جەماوەرە بەش خوراو و چەوساوەیەی کە من قەڵەمەکەم بۆ خزمەتی مەسەلەکانیان تەرخان کردوە ، ئەو متمانە و بڕوایی پێ بوونەی ئەوان کاریگەرتر و لانی هەرە گرنگی سەرکەوتن و سەر نەکەوتنی هەموو وێژەیەکە • متمانەی جەماوەر بە قەڵەمەکەی من ، بە قەڵەمی خۆی دەزانێ یان نا ، بڕوایی پێ بوونەکە هەیەیان‌نا ؟ چەندە؟ چۆنە ؟ ئەمە هەر چەندێ بێ ، هەر چۆنێ بێ بەلای منەوە هەر کەمە و پێویستی بە هەوڵ دان هەیە ، بۆ پەیدا کردنی ئەگەر دوور بێ هەر نەبێ ، بۆ زیاد کردن و پەرە پێدانی ئەگەر هەبێ ، بۆ پتەو و قووڵتر

کردنەوەی ئەمە ئەگەر ئەو متمانەیە زۆربێ و بەمە شکۆداربم ، کــە بەلای منـەوە تەنیا ئەمـە ڕێی ژیان و بـە فیرۆ نـە چوون و تەمری وێژەوان و هەموو کەسێکی دیکەشە •

بۆ ئەم دوو مەبەستە ، کـە هیچ کامێکیان بەبێ ئـەوی دیی نایەتە دیی ، یان ڕاست هیوای هاتەدیی لێ ناکرێ • وائەم بەرگەم چاپ کرد بەمە ، مەبەستی یەکەم دێتە دیی ، بەلام ئایا مەبەستی دووەمیش دێتە دیی و من شایانی ئەو بەرزی یەبم ؟ تێوە بڵێن ئەمە بێ ؟ دڵنیام لەوە کـە هەر بڕیاری جەماوەر ڕاست و سەرەکی و هەموو شتێکە •

بۆ ئاگاداریتان ، ئـەم ووتار و چاوپێـکەوتانە ، هـەموویان و بە تێکڕایی ، بە تایبـەتی ئەوانەی بلاوکراونەتەوە پاش ئەوەی پێیان دا چوومەوە و لێرە دا نووسیمنەوە ، هەولم دواە دەقەکانی کاتی نووسینیان بپارێزم و زۆر کەم نەبێ دەسکاریم نە کردوون • سوپاستان دەکەم •

خالید دلـێر

سلێمانی / گەڕەکی کارێزمووشک

١٩ی حوزەیران / ١٩٨٤

# پێشنیارێك (١)

ئەم ووتارە لە لا پەڕە یەکی ژمارە (١٢٠٠) ی ڕۆژنامەی (ژین) ی ڕۆژی پێنج شەممە ـــ ٢٠/٥/١٩٥٤دا بڵاوکراوەتەوە • بەبێ دەسکاری تێـدا کردن دەیخەمەوە بەر چاو • پەراوێزەکانی لە کاتی خۆی دا نـە نووسرابوون چونکە پێویستی‌یان بە نووسین نە دەکرد • لەم دوایی‌یەدا نووسیومن •

• وەکوو ئاشکرایە کـە یەکێك لەو هەقانەی کە گەلانی گیتی هەیانە (هەقی خوێندنە)بە زوبانی خۆیان وە خوێندنی مێژووی ڕابردووی باوکو باپیریانە.وە خوێندنی بویژ(٢) (أ د ب) ی خۆیانە • ئەو بویژەی کـە لە ناو جەرگەی هۆز وەردەگیرێ وە ئاوێنەی ژیانی ئەو گەلانەیە کە وێنەی چۆنیەتی ژیانی ئەو هۆزە ئەداتەوە •

یەك لـەو هۆزانەی گیتی هۆزە قارەمانەکەی ئێمەیە کـە هەتا ئێستا توانیوی‌یەتی زوبان و بویژی خـۆی بپـارێزێ وە بەرەو پێشـەوە ببات • نەتەوەی کورد لە خوێندن و نووسین بە زوبانی خـۆی بێ بەشـە لـەم کـاتەدا • هـەر چـەند کاك (ع•ب)(٣) ئەڵێ لـە قوتابخانە دەست پێ کراوەکانی(٤) کوردستانی عیراق بە زوبانی کوردیە • بەڵام دیسان لـە هـەموو قوتابخانە ابتدائیەکان نیـە • بۆ نموونە نزیکترین جێگا لە کاك (ع•ب) لـە شارەکەی خۆی (کۆیە) کە هـــەتا ئێستاش خوێندن لـە

قوتابخانەی کیژانی ابتدائی هەر بە عارەبیە • ئەمە جگەلەوەی کـە لە قوتابخانە ناوەنجی‌یەکان و بەرزەکان قوتابیەکانی کورد بێ بەشن لـە خوێندن بە زوبانی(٥) خۆیان • ئەمە لە لایەن خوێندنەوە •

بەلاّم لـە لایەن نووسین بە زوبانی کوردی ، ئەگـەر بلّێم نەتەوەی کورد بەشی لە نووسین زیاتر نی‌یە لە خوێندن بە زوبانەکەی لام وایە بە هەلّە نە چووبم چونـکە ئاشکرایە لە کوردستانی عیراق هەفتە و هەفتـە تاکە یەك ڕۆژ نامە دەر ئەچێ کە (ژینی خۆشەویستە) ئەویش لاپەڕەکانی چـوار یـەکی ڕۆژنامـە عارەبیەکـانە وە ڕۆژنامـەیەکی بوێژی و کۆمەلاّیەتی‌یە • وە سالّەوسالّ سێ (٣)یا خود چـوار پەڕتوك ( کتاب ) بە زوبانی کوردی دەربچێ یاخود نا • ئەمـە باسێکی کورتی خوێندن و نووسینە بە زوبانی کوردی کە ئەم بارە لە بناغەوە بە پێچەوانەی هـەقی نەتەوایەتی کوردە کـە هەقی (خوێندن و نووسینە بە زوبانی خۆی) من یەکێـکم لـەو کوردانەی کـە پڕ بە دلّیان حەز ئەکەن زوبانی پشتاو و پشتی باوك و باپیریان بلاّوبێتەوە و پێش کەوێت ، بە پێویستی ئەزانم کە هـەولّ بدرێ بۆ نیزن وەرگرتن لـە وەزارەتی کاروباری (الداخلیة) بۆ پێك هێنانی لیژنەیەك لە بوێژ و نووسەرە گەورەکانی کورد تا ئەم لیژنەیە هـەولّ بـدات بۆ پێش خستنی نووسینی کوردی چ هـەلّبەست و چ نووسین و ووتار و چ چیرۆك بە دانانی خەلاّت وە پشت گیری نووسەر و شاعیرە کوردەکان بکات بۆ بلاّوکردنەوەی نووسراوەکانیان ئەم لیژنە یە ڕۆژنامەیەك یا گۆڤارێك بە زوبانی خۆیەوە دەربهێنێ وە هەولّ بدات بۆسەندنی هەقی نەتەوەیی‌مان لە خوێندن بە زوبانی کوردی لە هـەموو پایەیەکی‌خوێندن دا بە هۆی بەرپا کردنی هێرش بۆ ئـەم هـەقە لە ناو مەجلیسی نوێنـەران (مجلس نیابی) وە لە ناو ڕەوشەن بیرانی عیراق وە لە خەلّك بگەیەنێ کە ئەو هـەقە هەقێـکی دەستووری‌و قانوونی و

نەتەوایەتی‌یە • ئەوەی شایانی باسە ، کە ئەم لیژنەیە گەلێك کۆسپی دێتە پێش لە کـاتی ئیش کردنی بەڵام من دڵنیام کە هیچ کۆسپەیەك خـۆی ناگرێ لەبەر قوڵنگی ئیشکەران وە هیچ شتێك بە بێ زەحمەت وە دەس ناهێنرێ •

هیوادارم کە ئەم (پێشنیارە) جێـگەی خۆی بگرێت وە من لـەو پێشنیارەدا بە ڕاستم نەزانی کـــە چۆنیەتی ئیش کردنی ئـەو لیژنەیە بنووسم • بەڵـکوو ئەمە ئەکەوێتـە سەر شانی ئەندامـانی ئەم لیژنەیەو توانای ئەوان » •

ـ بەغـدا ـ

# ئەی خامە

ئەم ووتارە ، شێوە پەخشانە ، لە ڕۆژنامەی : [ژین ـ ژمارە /١٢١١ ساڵی ٢٩ ـ پێنج شەمو ١٩آب/١٩٥٤ ـ لاپەرە (١) ]دا بلاو کراوەتەوە ڕاست کردنەوەی ڕێنووسەکەی نەبێ ، ئەوەی دیکەی بە دەقی خۆی دەخەمەوە بەرچاوی خوێنەر .

. دەستەودامانتبم ئەی خامە ، ووردترو دوور بین تر بە ، لە نووسینەکانتا . بۆ ئەوەی ژیانی گەل دیار بخەیت بە تەواوی وە بە بێ کەم و کورتی . تاوەکوو باشتر گەل لە ژیانی خۆی بگات ، هەروەهاش بەر چاوی دوژمنی بخە ، تاوەکوو ئەویش بزانی کەوا گەل خامەی وەك تۆی هەیە کە بەم جۆرە بە ووردی لە ژیانی گەل ئەکۆڵێتەوە و بە نووکە باریکەکەت ڕێگای ژیانی گەل بە دەر ئەخەی .

ئەی خامە ! گەل نووسراوە شینەکەی تۆی بە نووسراوێکی ڕووناك دێتە بەر چاو چونکە ڕووناکی ژیانی لە ناوا ئەبینێ . بەلام دوژمنانی گەل نووسراوە شینەکەی تۆیان بە شین ترو بە ڕەش دێتە بەرچاو ، چونکە دوژمن ئەزانێ کە نووسراوە شینەکەی تۆ هەش(٦) بۆ ئەو کۆنەکانەوە کە ڕۆژێك دێت ئەو هەشە کۆکراوەیە بەسە ، بۆ سەری ئەو دوژمنەو نقوم بوونی لەشی ئەو لەناویا .

**ئەی خامە !**

ئەو دوژمنە ئەزانی کە هەر چەندە ئێشی تۆ سستە ، بەلام هیچ

نرخێك نیە بۆ ئەو ئیشە سستەی تۆ تەرخان بکرێت ۰ لەبەر ئەوەیە ، بە هەموو توانای خۆی هەوڵ ئەدات بۆ کرینت ، بە هەر نرخێك بێت چونکە بە هەر نرخێکی تۆی پێ بکرێت لای ئەو هەر کەمە ۰ بەڵێ دوژمن هەستی بەوە کردوە ، گەلیش زیاتر هەستی بەوە کردوە ۰ لەبەرئەوەیە گەل بە هەموو توانای خۆی پارێزگاریت ئەکاتو تۆی کردۆتە ڕەهبەری خـۆی ۰

**ئەی خامە !**

دوو بارە تکات لێ ئەکەم کە بە ووردی و ڕاستی ژیانی گەل دیاربخە و بە گەلی نیشان بدە ۰ بنووسە لەسەر ژیانی ناهەمواری تیستەکەی و وێنەی ژیانی دوا ڕۆژی گەل بو گەل بکێشە ، ئەو ژیانەی کە لە سایەیقینکی ئاسایش لە باخی خۆشیوکامەرانیدا دەحەسێتەوە ۰

**ئەی خامە !**

وەك تۆ بەڵێنت بە من داوە کە تکایەکانم بەجێ بگەیەنی وە لە نووکە باریکەکەت ژیانی گەل بە دیاربخەی ، منیش بەم جۆرە بەڵێنت پێ ئەدەم (کە هەرگیز بە هەموو سامان و دراوی دوژمنی دەوڵەمەندم نەت فرۆشم ، هەر چەندە نرخی تۆ ئەی خامە تەنها سەد فلسێکە ) ۰

**ئەی خامە !**

تۆ زۆر حەز ئەکەیت نەشکێیت لەبەرئەوە بەڵێن بێ بەبێ وەستانەوە لە پێناوی ئاشتی دا تێ بکۆشم بۆ ئەوەی بت پارێزم لە شکاندن و لە کار کەوتن وە هەتا بتوانییلە ژێر سایەی ئاشتیدا ئاواتم بهێنیتەدیی کە دوانە لەباری ناخۆشی ژیانی گەل ، ۰

**ـ گۆیە ـ**

# پسه پسێك ( همسه ) بۆ ناو گوێی ژین

**ئەم ووتارەش لە لاپەڕە (١)ی (ژین)ی (ژمارە/١٢٢٨)ی پێنج شەمو ـ ١٦/ کانوونی یەکەم / ١٩٥٤ دا بڵاوکراوەتەوە •**

• ئـەم ووتارە بچکۆلانەیە ، لە ڕێگەی ئـەو ڕۆژنامەیەوە ، کە ڕۆژنامەیەکی وێژەیی‌و کۆمەڵایەتی بوو ، خەڵکی لە هێرشی ئەو سەردەمە ئاگادار دەکردەوە کە ئیمپریالیزم و داب دەزگا بە کرێگیراو و کۆنەپەرستەکانی لە عیراق‌و لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا بە دەستیانەوەبوو بۆ سەر گەلانی ئەو ناوچەیەی‌بەن • لە پاش ئەو ووتارە ، زۆری نەخایاند ـ وەك لە بیرم مابێ ـ کە پەیمانی سەنتۆ لە تاران‌دا مۆرکرا » •

دەقی ووتارەکە :ـ

**ژینی خۆشەویست !** ئەی تاکە ڕۆژنامەی کوردی لە کوردستانی عیراق دا ، هەر وەك خۆت ئەزانی ، پێویستی‌یەکی زۆر گەورە و گران لەسەر شانی تۆیە ، کە پێویستە وە هیواداریـن بـە گورجی وە بەبێ باکی هەڵی گری و لە هیچ کۆسپ و کەندێك نەسڵەمیتەوە • چونکە لە کۆسپ سڵەمینەوە پیاو ترسنۆك و شبرزە ئەکات ، برینگانەوە لە ڕۆیین بەرەو ئامانج ، لەش‌و بیر فێری تەمبەڵی و درێنی کردن ئەکات •

ئەو پێویستی‌یە گەورە و گرانەی لەسەر شانی تۆیە ، کە بەرز

کردنــەوەی زوبان و ویژە (أ د ب)ی کوردیــە (لەسەر شێوەی تازە) وەشان دانە بەری باری کــەچی کۆمەڵایەتیمانە ، بۆ ڕاست کردنەوەی وە دووانە لەو شتانەی بوونەتە هۆی کەچیی و خواری ئــەم بارە ، وە ئاشکرا کردنیانە بۆ کۆمەڵانی خەڵك ، تاوەکوو ئەوسابکەشێتەوە بە وەی کــە ئەگەی بە ئامانج و ئەو سا کە هیچ گومانی تیانی‌یە کە هیچ زارێك نا توانێ گلەیی لە ناو بێتە دەر .

هــەر چــەندە ئێمە ئەزانین لــە گیتی ، هەتا سەر هەر بەهار ، یا هەر هاوین ، وە یا هەر پاییز نابێ (لەم ڕۆژەدا) پاییز بەسەر چــوو ، ئێستا بــەرەو زستانئەڕۆین ، ســەرما دەستی کردەوە بە گوێچــکە و لووت و پەنجــە تەزاندن ! ! بەڵام کــە ئێمــە ڕێبوارین . نابێ لــەو سەرمایە بترسین ، بەڵکوو پێویستە بڕۆین بەرەو ئامانج و قۆناغمان چونکە ئەگەر هەر لەسەر ڕۆیینی خۆمان ڕۆیشتین لەشمان گەرم دادێتو سەرمــا کارمان لێ‌ناکا ، بەڵام ئەگــەر بۆی دانیشتین ، ئــەو ا هــەموو لەشمان ئەتەزێ وە سەرما خۆی لەسەرمان ئەکا بە شێری نەبەز

ئێمــە ئەو پــە پسەت لە گوێ ئەکەین ، نالێین‌لەو چوار چێوەی لەدەوریان کێشاوی سەربهێنە دەرەوە ، بەڵکوو داوای ئەوە ئەکەین لــە ناو چوار چێوەکەدا بجووڵێتەوە ، هەتا سەر ، وە بە بێ درێغی کردن .

ـ کەرکووك ـ

# هـــيوا

ئەم بەخشانە لە مانـگی تشریـنی دوومی ١٩٥٦ دا نووسـراوە و لە نـامیلکەی ( گزنـگی هـەتاو ) (٧)دا بلاوکراوەتەوە •

**هـــیوا**

بە هێزە

لە هەموو هێزێ بە هێزترە

هێزانی ـ هایدرۆزین ـ ئەتۆم ، ئەلەتریك

چ هێزێك لە ئەوان بە هێزترە ؟

هیچ هێزێك لە ئەوان بە هێز تر نیە لەو کاتەدا تەنها

هیوا نەبێ • هیوا لە ئەوان بە هێز ترە چونکە :ـ

« ئەوەی هێزی هایدرۆزین و ئەتۆم و ئەلەتریکیشی

دروست کرد ، هیوا بوو » •

هەر هێزێکی تر دروست بکرێ یا بدۆزرێتەوە

بە هۆی هیواوە ئەبێ •

لە هەموو تینێ تواناترە

چ شتێك ئیمڕۆ لە مرۆڤ تواناترە ؟

کە دروست کەری ئەو شارستانیەتەیە کە مرۆڤایەتی هەتا ئیمڕۆ

شارستانیەتی وەهای نەدیوە .

کە دروست کەری ئەو پێشکەوتنەیە لە هەموو لایێکی ژیانەوە

مرۆڤ لە هەموو شتێ تواناترە .... بەڵام

هیوا لە مرۆڤ تواناترە ... چونکە :ـ

هیوا مرۆڤایەتی لێ خوڕی وە باڵی پێوەنا بۆ دروست

کردنی ئەو شارستانیەتە . وە هەر ئەو لە دوا ڕۆژا

ئەو شارستانیەتەمان بێ دروست دەکا کە ئێستا خەوی

پێوە ئەبینین

هیوایە ، کۆڵەگەی ڕاگری تەلاری ژیان

مرۆڤ بە خوێنو و دەمار و گۆشت و ئێسقان نازێ ، بەڵکو

مرۆ بە هیوا ئەژێ . هەر مەردومێك هیوای نەبێ

مردوە ، با خوێن و گۆشت و ئێسقان و هەموو پێویستی‌یەکی

تری ژیانی هـەبێ .

ئەوانەی هیوایان نیە لە تاریکی‌یەکی بێ سنووردا ئەژین .

ژیان لە تاریکیشا مردنە •

جیاوازی چیە بەینی تاریکی گۆڕ و تاریکی سەرزەوی ؟

مەردوم بە نەبوونی چاو کوێرنابێ •

بە نەبوونی هیوا کوێر ئەبێ •

گەلێ کوێری دڵ بڕ هیوامان دیوە ، کرداری وەهایان‌کردوە ، کە

چاوی چاو ساغەکان بڕوایان بە ڕاستی ئەو کردەوە نە

کردوە و سەریان سوڕ ماوە •

گەلێ کوێری هیوادار هەنە گەیشتوونەتە پلەی وەها ،

چاو ساغەکان کە سەیری شوێنەکانیان ئەکەن ،

کلآویان لەسەر بەر ئەبێتەوە !!

هیوا

ڕووناکی چاوە

هۆی ژیان و پێش‌کەوتنە

تواناترین تینە

بە هێز ترین هێزە

ـ کەرکووك ـ

# ملاحظات حول القصة الكرديــة

## أين الروايات والقصص الطويلة في ألادب الكردي

من المعلوم ان فن القصة هو احد الاعمدة الرئيسية التي ترتكز عليها عمارة الأدب الحديث الشامخ بصورة عامة .

والقصة تعد احدى الوسائل المهمة التي يستطيع بها الاديب ان يعبر عن افكاره وآرائه واحاسيسه وملاحظاته حول مشاكله الخاصة ومشاكـل ابناء مجتمعه ويبين بها طرق حلها وتسهيلها ويوضح تطلعات شعبه وآماله.

ونظراً لتطور الحياة ومتطلباتها الكثيرة . ومشاكلها وارتباط هـذه المشاكل بعضها بالبعض وسعة ميدان التعبير في القصة ، فقد احتلت القصة لنفسها هذا المكان البارز المهم في الادب الحديث .

والقصة في الادب الكردى مع كونها متأخرة ، فقد خطت بعــض الخطوات في مضمار التطور والتقدم غير انها لازالت بعيدة عن احتــلال مكانها وعاجزة عن اشغال الفراغ الواسع الذي يحيط بها . وسرعة تطور القصة في عصرنا هذا اقل من سرعة تطورها في العهود السابقة بكثير . ففي الوقت الذي نرى ملاحم قصصية رائعة كثيرة من امثال ( مم وزين ) ، تركها لنا ادباء شعبنا في العهود الماضية لاتـزال تحرك اعمـاق سامعيها وتنـال استحسانهم ، نرى القصة الكردية الحديثة متأخرة بكثير .

ولا اقصد بالقصة الكردية الحديثة هذه المجموعات القليلة التي نشرت مؤخرا ، اذ انني والحق يقال لم اقرأ معظمها لحد الآن ولم اسمع من احد ما يشجعني على قراءتها • وانما اقصد المجموعات التي نشرت في سنوات ما قبل ثورة تموز ١٩٥٨ ، وبعدها بقليل • اقول ذلك دون ان انسى وجود بعض القصص الجيدة ، منها على سبيل المثال قصة خانزاد ، للسيد جمال بابان وبعض قصص السيد محرم محمد امين و - بووكى زێردەوارى ڕەش -اى عروسة الخيمة السوداء ، التى لا اتذكر مع الاسف ، اسم كاتبها

وارجو ان تكون القصة الكردية قد دخلت فترة الارهاص ، لاسيما بعد ان شاهدت كردستان مآس وآلام في السنوات الماضية تجدر بأن تكون مواضيع تخلق منها روائع قصصية ، وتتمخض في المستقبل القريب عن قصص جيدة تضع نهاية لازمة القصة الكردية •

الملاحظ في القصة الكردية المنشورة لحد الفترة التى ذكرتها سابقا بل واقول لحد الآن ، ان اكثرها قصص قصيرة ولم تنجح الادب الكردى لحد الآن مع الاسف الشديد في انتاج قصص طويلة أو روايات •

والملاحظة الثانية في القصة الكردية هى ان معظمها يتحدث عن مشاكل وآلام دون اعطاء الحل الجذرى او الحل الكامل لها •

غير ان ذلك يجب ان لا يمنع الاديب الكردى من قول كلمته الحقة الفاصلة • وبهذه المناسبة اقول ان رسالة الاديب المقدسة لا تنحصر

في كشف نواقص الحيـــاة وعيوبها والتعبيـر عن آلام الشعب وطبقاته المضطهدة لان ذلك هو جزء من رسالته • اما الجزء الأهم فهو تبيان طرق الحل ووسائله والعمل على ادخال هذه المفاهيم عن طريق الانتاج الأدبي في اذهان المجتمع •

اما الملاحظة الاخيرة التي لاحظتها في القصص الكردية القليلة التى قرأتها في المجموعات التي نشرت مؤخرا أى بعـــد ايقاف حرب اقتتال الاخوة ، ومع ان الملاحظة تطبق على عدد قليل جدا من تلك القصص ، غير انني ارى من الضرورى عرضهـا • والملاحظـــة هى تسرع بعض القاصين في الكتابة دون ان يقـوموا بتمحيص دقيق لمجمل الفـكرة او الموضوع الذى تدور حوله القصة ، مما اوقعهم في اخطاء كبيرة • كاحدى قصص السيد احمد اسماعيل المنشورة في كراسته ـ داره‌كه‌ى به‌ر ماڵمان ـ الشجرة المواجهة لبيتنا ـ اذ انه يساوى فيها بين احـــد الفدائيين المناضلين وبين احد خونة الشعب وكذلك احدى قصص السيد كاكه مـه‌م فه‌خرى المنشورة في مجموعته ـ بومه له‌رزه‌له گۆمى مه‌نددا ـزلزال في بركة هادئة ـ ومع كون القصة تقدمية الا ان سياق الفـكرة قاد القاص الى تهويل دور الارهاب والبطش واظهاره بمظهر العامل الحاسم فـــي مسألة الصراع بين الحق والباطل •

وختاما اتمنى التحرك الأنشط والاكثردقة لقصصينا وتقدما مضطردا لهم وآفاقا جديدة للقصة الكردية •

**« نشرت لي جريدة النور ( العدد ٣٨٦ ـ في ٢٢ـ١ـ١٩٧٠ ) هذه الاسطر باللغة العربية ، ورايت من الانسب عـدم ترجمتها الى اللغـــة الكردية ، بل ابقائها واعادة نشرها نصا وهي باللغة العربية » •**

وجه الي ، في حينه : من ادعى بانه مراسل جريدة العراق ، الصفحة الادبية ، بعض الاسئلة ، حول القضايا الادبية المطروحة في تلك الفترة ، وهذه هي اجوبتي عليها ، التي لم تنشر في حينه والتي حبذت بقائها باللغة العربية .

**الجواب الاول : ـ**

**الجواب الثاني : ـ**

انتمي الى مدرسة الواقعية الاشتراكية ، وانني مكرس أدبي المتواضع لخدمة المستثمرين والمضطهدين (بفتح الميم والهاء) . ولكون تلك المدرسة هي الوحيدة التي يستطيع من خلالها الاديب والكاتب ـ كل حسب امكانياته واسلوبه ونوع ادبه ـ ان يساهم في عرض قضايا هؤلاء البؤساء والمعدمين وتبيان حلولها ووسائل تحقيقها بشكل جلي وواضح امامهم ويخلق في نفوسهم وافكارهم الرؤيا الواضحة والاندفاع والتوثب للقضاء على كل اشكال الاستغلال والاضطهاد . ويتمثل ذلك اليوم في التصدى الحازم للامبريالية والصهيونية والرجعية وان يطور الاديب من خلالها نفسه وادبه تمشيا مع حاجة تطور المجتمع الى ذلك . فهذه هي المدرسة التى تشد من تلاحم الشعب والاديب ويدفع هذا التلاحم الاديب الى قمة الابداع . فتوخيا لتحقيق هذه الاهداف والامنيات وغيرها ، التى اعتبرها قمة ما ابتغيه في الحياة انتمى الى هذه المدرسة .

**الجواب الثالث : ـ**

الشعر الكلاسى الكردى ـ هى تلك الحديقة الزاهرة ، البديعة ، التي استطاع فيها البستانيون ـ وهم الشعراء الكلاسيون الاكراد ـ العائشين في طبيعة كردستان الباسمة ، ان ينبتوا ويربوا فيها أروع الورود والرياحين ـ وهى قصائدهم ـ التى تعتبر وتعبر عن اعلى واجمل واكمل

ما توصـــل اليها الذوق الشعري الـكردي والقريحة الـكردية في تلك الازمــــان .

امـــا الشـــعر الحـــر الـذي اعـاد ظهوره في دنيـــا الادب وهـــو المعبـــر الشعري الصادق عن معاناة وافـكار واهـــداف شعرائنا الشباب عمرا ، وهو محق كل الحق - في هذه الايام والحياة المعقدة - في المطالبة بالحرية والانعتاق من بعض قيود الشعر الكلاسي ، ولـكن لا اوافق على اهمال جميع شروط الشعر الكلاسي وعلى الاخص ، الموسيقى الشعري ، ليكون حقا شعرا لذيذ الطعم وطيب الرائحة ويعبر عن ذاتـــه وعن اماني واهداف الشعب في هذه الحياة السريعة التطور .

**الجواب الرابع : -**

ان الكثيرين من مجموعة (روانـگه) هم مـن اصدقائي ومعارفي ، واقدر النواحي الايجابية في انتاجاتهم الادبية . ومع ذلك فهذا لا يمنعني من قول ما اعرفه عنهم بصراحة . واعتقد ان هذا هو الواجب لا بالنسبة لي ، وانما بالنسبة لكل اديب ولكل انسان ملتزم . ومع ان المجموعة لم تبق كمجموعة موحدة منذ مدة ، غير ان توجيهكم للسؤال بهـذا الشكل يضطرني الى التحدث عنهم بايجاز

ان المجموعة ظهرت ، أول ما ظهرت ، ككتل انتخابي - وكان هذا حقا مشروعا لهم - للفوز في المؤتمر الاول لاتحاد الادباء الاكراد الـذي كان من المقرر عقده في بداية ( حزيران ١٩٧٠ ) على ما اتذكر ، كانت المجموعة ، بصورة عامة تتكون من عدد من الادباء الشباب ، غير موحدي الفكر والنهج . اما بيانهم الأدبي ، الذي نشروه ، ورفضوا فيـه الواقع الادبي السائد آنذاك فكان وسيلتهم للظهور ككتل ادبي يجلب الانتباه ،

وعندما لاقوا بعض التشجيع من لدن بعض الشباب ، ادعت المجموعة بانها هي التي خططت النهج الادبى الكردى الحديث الذى يرفض الواقع الادبي برمتـه •

فكانت المجموعة فكريا وطبقيا من البرجوازية الصغيرة ، وكانت مجموعة تائهة ، ففي الوقت الذى رفضت الواقع الأدبي بمحاسنه ومساوئه لم تستطع ، وهي في هذه الحالة الفكرية ، ان تأتي بواقع كتلوكى بل تاهت في متاهات تصوراتها • اذ ان رفض الواقع برمته ـ اى واقع كان ـ لا يصح ، ولا يمكن حتى الثورة عليه دون الاعتماد على بعض الاجزاء الصالحة منـه ، او الممكن اصلاحها لذلك الواقع • ولا يشعر الان بوجود المجموعة ، ولعل اهم عوامل ذلك هو عدم وجود الفكر بين افرادها كما قلت • وقد سبقت وان ظهرت حالات مماثلة في ادب كثير من الشعوب الاخرى •

**الجواب الخامس : ـ**

اهم قصائدى التي الفتها الى هذا التاريخ ، حسب رأيى ، هى قصيدة لم تنشر لحد الآن وهى بعنوان (هدية أيار المتواضعة) وتتكون من ثلاثة فصول • ففي اولاها تعرض قضية الطبقة العاملة كقضية بصورة عامـة • وقد تم نظم هذا الفصل ويتكون من مائتين وستون بيتا (٨) والفصل الثاني يعالج فيه كيفية حل هذه القضية • اما الفصل الاخير فيوضح العلاقة القوية بين هـذه القضية وبين المسألة الوطنية • وآأمل ان انجز نظم الفصلين الاخيرين ايضا •

**١/ تشرين الاول / ١٩٧٦**

# فۆلکلۆرەکامان تۆماری تۆمار نەکراو

فۆلکلۆر ، ئـــەو ووشەیەی کە لە ساڵی ١٨٤٧
ی ئینگلیزی دایهێناوە ، لـــە میـراتی دێرین و لە
مێژینەی نەتەوایەتی زۆر و زەبەند داءئەو هونەر و پیشەسازی و کردەوەو
یاری‌یە جۆر بـە جـۆر و ، نەریت و بابەتی تێـگەیشتن و بەند و وباوە
خاوەن نا دیارەکان دەگرێتەوە کە لەگەڵ جۆری ژیان و سروشتی دەروونی
و ئارەزووی سروشتی‌یانە و سەلیقەو پلەی تێگەیشتنی جەماوەری میللەت
دا دەگونجێ ، بە پێی سەردەم ، هەر سەردەمە هی خۆی •

ئەوەی ڕاستی بێ ، تا ئێستاش ، پسپۆڕانی فۆلکلور ، سنوورێـکی
دیار و ئاشکرای ئەو تۆیان بۆ فۆلـکلۆر نەکێشاوە ، تـا بە بێ ئـەرك
کێشان و بیر کردنەوە لە با بە تەکانی دیکەی سامانی نەتەوایەتی دا ، وەك
کەلەپوور و وێژەی میللی و •• هتد جیـا بکرێتەوە • ئەو مەرجـــانەی
تا ئێستا ئەو پسپۆرانە لەســەری یەکن کــە دەبێ لە فۆلکلۆر دا هەبن ،
هــەر ئەمەندەیە کــە دەڵێن دەبێ ئەو فۆلـکلۆرە لەگەڵ سـەلیقـەی
سروشتی و زەان و پلەی تێگەیشتنی توێژەکـانی ژێرەوەی جـەماوەری
میللەت دا بگونجێ و بێ خاوەنیش بێ •

بێ ئەمەك نەبین ، کــە ئەمە لە هەمووشتێکی خراپ نا شیرین ترە،

داهێنەرانی فۆلکلۆر لـە یاد نەکەین کە سەربازی نەناسراوو خەڵــکی لە خۆ بوردوو ، مۆمی تواوەی ڕووناکی و خۆشی و ئاسوودەیی بەخشی ژیانمان و سامانێــکی زۆری بێ ئەندازەیان بۆ بــەجێ هێشتووین ، بێ ئەوەی هەر تەنیا ناوێك بۆ خۆیان ، لە پاش مردنیان بەجێ بهێڵن .

بە شەکـانی فۆلـکلۆر ، چی ئاکە ئاکەبێ و چی بەتێـکڕایی بێ ، بۆشایی‌یەکی زۆر لە ژیانی گەلەکەی خاوەنی دا پڕ دەکەنەوە و کارێـکی زۆر دەکەنە سەر ژیانی و ڕۆڵەکانی ئەو گەلەحەزبکەن یا حەزنەکەن ، تا ڕادەیەکی زۆر دەستیان هەیە لە کێشانی نەخشەی ڕەوتی ژیانی سەردەم و دووا ڕۆژیشدا .

ئەم سامانە زۆر و زەبەندە ، لەگـەڵ گۆڕان و پێشکەوتنی ژیانی خەڵکدا هەر لە زۆر بوون و گەشە کردن و پێش خستن دایە . نـەوە لەدوای نەوە ، ماوە لـە دوای ماوە ، دەیخەنە سـەری و بارستایی ئـەو خەرمـانە پڕ لـە خێر و فـەڕە بەرز دەبێتەوە و ژمارەی سەربازە نا دیارەکان ، کە داهێنانی میللی و سادە و ئاسایی هەر لە خۆیان دێ ، زیاد دەبن . فۆلکلۆر لەگەڵ هـەر گۆڕان و پێشکەوتنێکی‌دا ، زیاتر لە ژیانی سەردەمی گۆڕانەکە نزیك دەبێتەوە و کەڵکی بۆ ئەو ژیانە زیاتر دەبێ .

فۆلـکلۆریش دەسکاری دەکرێ . بەڵام نابێ هەر کەسێ لــە خۆیەوە بەبێ ئەوەی ئامادەیی هەڵسان بەم ئیشەی لە باردا هەبێ ، دەست بەســەر ئەم ئەرکــە دا بـگرێ . ئــەوەی ئەم فرمــانە بگرێتــە خۆیەوە ، دەبێ شارەزایی‌یەکی زۆر و قووڵی لـە فۆلکلۆردا هــەبێ و سەلیقە و زەوقێکی سادە و میللی یانە و بێ خەوشی هــەبێ و لە هەموو لایێــکی پێویستی ژیانی سەردەمی گۆڕان تێدا کردنەکەدا شارەزابێ و چەندی و چۆنی گۆڕانەکە وەستایانە هەست پێ‌بکاو و دەست نیشان بکا و

زۆر مەرج و پێویستی دیکەش بۆ ئەنجام دانی ئەم فرمانە پێویستن •
پێویستە فۆلکلۆر بە هەموو جۆر و بەشەکانیەوە پێش بخرێ بە مەرجێ
تام و چێژی ڕەسەنی خۆی لە دەست نەدا و ئەوەندە پێش خستەی
بخرێتە سەری کە ژیانی ئەو سەردەمە گەرەکیەتی ، بەو مەرجە تامو
چێژەکەی هەر لە تامو چێژی پێشوی وەرگیرابێ و ئەوی تێدا دیار بێ •
بمانەوێ و نە مانەوێ ، فۆلکلۆر هەر پێش دەخرێ و گۆڕانی هەر تێدا
دەکرێ • وە لە پێش ئێمەش گۆڕانیان تێدا کردوە • بە نموونە دەڵێم :
جلو بەرگی کوردی کە لەباوك و باپیرانەوە بۆمان بەجێ ماوە
دەسمایەیەکی فۆلکلۆریمانە ، لەسەرەتادا ، کە داهێنراوە وەك هی
ئەمڕۆمان نەبووە • لە پاش گۆڕان کاری و دەسکاری تێدا کردن
ئەمڕۆ جل و بەرگێکی جوان و ڕێك و پێك و لەبارمان بۆسروشتی
ژیانی ئەمڕۆ هەیە •

یا هەندێ لە ئاوازە کوردییە ڕەسەنەکانی بۆمان بەجێ ماون ،
ئێستا گۆڕانیان تێدا کراوە و بەسەر ئامێرەکانی مۆسیقەی ئەم سەردەمەدا
دابەش کراون و تامو چێژێکی نایاب دەبەخشن کە هەر لە تام و
چێژەکەی هەوەڵی خۆیەوە هاتووە •

سەرچاوەی فۆلکلوری کوردی ، گەلێ زۆرن ، فرەوانن ، فرە
ئاون و جێگەی دڵ خۆشی و مایەی شانازی گەلەکەمانن • ئەگەر بە
چاوی پێویست سەیریان بکرێ مایەی پێشکەوتن و کەڵك بەخشینی
گەورە و زۆرن لە ژیانی گەلەکەماندا بۆ نموونە دەڵێم :ـ دەتوانرێ
لە ڕێگەی پێشخستنی فۆلکلۆرەوە ، ڕەوشنبیری کوردی ، هەروەها
هونەری کوردی ، وەك شانۆگەری و هەڵپەڕکێ و گۆرانی و مۆسیقە و
وێنەکێشی و ••• هتد هەنگاوی گەورە بەرەو پێشەوە بنێن ، چونکە لەو

بارو دۆخەدا ، وە لە پاش دەست کەوتنی ئەو ئەنجامە باشە ،ئەو لانانەی زیانی گەل کە ناومان بردن ، لە فۆلکلۆرێکی پێشکەوتوو گونجاو لەگەل پێویستی‌یەکانی سەردەمدا ، کەرەستەی زۆر بە کەلکیان لەبەر دەستدا دەبێ و لە گەشەکردنی خۆیاندا کەلکی لێ وەردە گیرێ • چونکە ئەو لانانە لەگەڵ فۆلکلۆردا بە هیچ شتێك لە یەکتری جیا ناکرێنەوە

لەم سەردەمەی ئێمەدا ، فۆلکلۆر ، مافی تەواوی خۆی لە ئاوێ پێدان و خزمەت کردن نەدراوەتێ • بەڵام هەندێ لە بەشەکانی کەم تا زۆر بەرەو پێشەوە پاڵیان پێوە نراوە و ئەم پال پێوەنانە هەموو بەشەکانی وەك یەك نەگرتۆتەوە ، بۆ وێنە خواردەمەنی‌یە فۆلکلۆریەکان بەرەو لە ناوچوون دەڕۆن • وەك (سەمەنی ـ کە لە زۆربەی شارەکانی کوردستاندا دەکرا) ، یان (تەڕە ساز ـ کە ئەمیش خواردنی زۆربەی خەلکی کوردستان بوو)یان ( بڕمان ـ Birmam ) ـ کە لە سرکەی هەنار و ـ دەنکە هەناری ووشك کراوە دروست‌دەکراو ـ خواردنێکی زستانانی خۆشناوەتی و ناوچەی‌کۆیەو ... هتدبوو ) و ... زۆر جەشنە خواردەمەنی دیکەش یان ئەو خزمەتەی کە هی گۆرانی و مۆسیقەی فۆلکلۆری کوردی کراوە ـ لەگەل کەمیی خۆشیەوە ، وە لەگەڵ بوونی سەرنجی تایبەتیم لەبارەیانەوە ـ هی بەیت و بەندە فۆلکلۆری یەکان نەکراوە • دەبوو تا ئێستا گەلێ چیرۆکی شانۆیی و تابلۆی سەماکردن و هی وێنەیی جوان جوانیان لێ دەربهێندرێ •

فۆلکلۆر ، وێژە و هەنەری سەلیقەی سادە ترین توێژەکانی جەماوەری میللەتن • بۆیە ڕاست‌ترین شێوەی ، زەوق و هەست و نەست و خواستی ئەوان بەبێ پێچ و پەنا دەردەبڕن ، هەر بۆیەش پاك ترین و ڕووترین ئاوێنەی ژیانی سەردەمی کۆمەلانی خەلکن • لە فولکلۆر دا

هەموو لاتێکی زیانی گەل دەردەکەوێ • فۆلکلۆر جۆر و بابەتە زیانێك دەر نا برێ کە گەلەکە خۆی نەیدیوە و بەسەری نەهاتووە و بەو قۆناغەدا تێ نە پەڕیوە •

لێرەدا ، بە مەبەستی پاراستنی ڕووی گەش و ڕوونی فۆلکلۆری میللەتەکەمان ، نا چاری بالم پێوە دەنێ کە هەندێ لە بیروباوەڕێك بدوێم کە هەوڵ دەدا ، کۆمەڵانی خەڵك واتێ بگەیەنێ - بە مەبەستی هەڵە کردن و ڕاستی لێ شاردنەوەیان ـ کە فۆلکلۆری کوردی پەیوەندی نەبووە بە زۆرانی چینایەتی‌یەوە ، ئەو زۆرانە لەو ئاوێنەیەدا ، هیچ وێنەیەك ، یان تارمایی‌یەکی نە نواندوە ، کەواتەئەو زۆرانە ، لە سەرەتادا و لەمێژووی کوردستان دا هەر نەبووە و بیروباوەڕی سۆشیالیستی زانستی ، کە دەڵێ ئەم زۆرانە لە ناو کۆمەڵی دوو چینەدا ، یان فرە چینە دا هەر هەبووە و هەر دەش‌بێ ، هەتا چەوساندنەوە لە ناو نەچێ ، نا ڕاستە و نیشانەی ڕاستی‌ی نە پێکاوە !! لە پاش ئەمەدا ، ئەمجا مەبەستەکەی دەردەبڕێ لە شتێکی وەها دا کە بڵێ چەوساندنەوەی چینایەتی خوێنمژینی خەڵکی ڕەش و ڕووت هەر نەبووە و ئێستاش نی‌یە و کەواتە ••• هتد •

هەر نووسەرێك کە هەڵگری ئەم بیروباوەڕە بێ ، یان ڕاستر هاندەری ئەو بە ناو بیروباوەڕەبێ ، چی دەڵێ و چی دەنووسێ لە وەرامی ئەم ڕاستی یانەی کە لە خوارەوە دێنە بەرچاومان و چۆن وەرامی پرسیارەکانی خەڵکی دەداتەوە ، کە لەو ڕاستی‌یانەدا دەردەچن :

ئەو بەشانەی فۆلکلۆر کە دژی زۆر داری کردنن هی چەوساندنەوەی چینایەتی بێ ، کە زۆربەی زۆرداری کردنەکانی

هەموو سەردەمێك ، لە چوار چێوەی ئەم دا دەژمێردرێن ، یا هەر چەشنە زۆرداری‌یەکی دیکە بڵێین ، بێ گومان لە مێشك و دەروونی ئەو کەسانەوە سەری هەڵداوە و هەڵقوڵیوە و تەقیوەتەوە کە خۆیان جەوروستەم و چەوساندنەوەیان دیوە • ئەو بەشە نەمرانەی فۆلکلۆر لە دەروونی ئازار و ئەشکەنجە دیو دا جنگڵی داوە و هەڵقوڵیوە • ئەوەی کە دڕندەی برسیەتی بە نینۆکەکانی وورگ و ڕیخۆڵەکانی نە ئەنجنیبێ ، نازانێ بڵێ (زگی برسی ، هیچ نابرسوی)(٩) وە هەر بۆشی نایە ، یان ئەوی جیاوازی یەکی چینایەتی قووڵ ، کارێکی قووڵتری تێ نە کردبێ، نازانێ و بۆی نایە بڵێ : «زگی تێر ئاگای لە برسی‌نی‌یە»(+) •ئەوانەی مارانگازی زۆرداری و ستەم نەبن ، چۆن دەتوانن ئەو قسەیە هەرگیز نەمرە بکەن کە وتوویانە : «ناو بتبا لە پردی زاڵم ـ نامەردیش گوتراوە ـ مەبەڕەوە • •»(١٠) •

کۆمەڵگایەکی جووتیاری داغ کراوی هەتا سەر ئێسقان نەبێ ، کە ڕژێمی ئاغایەتی داغی کردبێ ، کێ دەتوانێ ئەو قسەیە بکا کە لە هەموو وولاتی کۆیەدا باوە کە ووتوویانە : «ئاغا لوولاقی بشکێنی ، گووسەکی تێدایە !! »(١١) • یان هەر جەماوەرێکی برژاوی ناو کوورەی چەوساندنەوەی دەرەبەگایەتی نەبێ ، وەك ئەوەی سەرەوە کە تازە باس کردنی ڕەت بوو ، کە بە مەرگی ئاغا کەیان خۆش بوون و لە ترسی خزم و کەس و جەندرمەکانی ئاغای مردوو نەیان توانیوە بە ئاشکرا ئەو بێ‌خۆش‌بوونە دەربڕن ، ئەم جەماوەرە نەبێ ، کێ دەتوانێ قسەیەکی وەك ( ئاغاڕۆ ••• خوا شوکور )(١٢) بدۆزێتەوە یان بۆی بێ ، کە ئەم بۆ هاتنەش هەر لەباری زیانەکەوە هەڵقوڵاوە و بەو قسەیە ، لە سەرێکەوە ،

---

(+) قسەیەکی پێشینانە •

دەست و دایەرەی ئاغای بێ هەڵخەڵەتێنێ ، وەك ئارمایی‌یەكی ئەمومزی كە بەسەرقسەكەدا كێشاویەتی ، وە لە سەرێكی دیكەشەوە خۆشحاڵی و بێ‌خۆش بوونی خۆی و زۆر لێكراوەكانی برای تێدا دەربڕێ ؟!!

میللەتێكی چەوساوە و داغ لە دڵ دژی زۆرداری و خۆڕاگرو كۆڵنەدەر و دوور بین نەبێ ، كێ ئەقڵی بۆ ئەوە دەچێ ، كێ ئەمەندە زیرو هێژاو بلیمەت دەبێ كە ئەمەندە قووڵ بوویێتەوە و بڵێ :ـ «هەموو شتێك لە باریكی دا دەپسێ زۆردار لە ئەستووری ؟!! »[13] وە زۆر شتی دیكەش كە لە بارەی زۆرداری و زۆرانی نێوان خوێنمژراوو خوێنمژ دا گوتراون و بێ گومان ئەو قسەنەستەق و نیشان ئەنگێوانە هەر لەلایەن چەوساوە و زۆر لێكراوانەوە گوتراون .

چۆن « ماران گاز لە خشبەی گوریس دەترسێ »[14] وە جۆرە سركی ، یان سڵی‌یەكیان تێدا پەیدا دەبێ كە لە هەموو شتێكی مارو هەر شتێكی دیكەی كە بە هی ماریش بچێ سڵ بكاتەوە ، خەڵكی جەوْر و ستەم دیدەش هەروەها جۆرە سركی یەك ، یان جۆرە هەست ووردی‌یەكی لەلا پەیدا دەبێ و ژیری یەك لەو چەوساندنەوەیە فێردەبێ ، بە بێ‌ی « هەر ئەقڵە لە خەسارەیەك » كە وەهای لێ دێ ، بە چاكی دەمار و ماكی چەوساندنەوە و چەوسێنەرەوە دەناسێ .

لە لایەكی دیكەشەوە ، زۆرداران و چەوسێنەرەوەكان ، لە كوردستانیشدا ئەوەندە لە ناو چەوساندنەوەی خەڵك‌و مژینی خوێنی زەحمەت كێشاندا كوڵاون و شارەزابوون ، بە ڕادەیەك گەیشتوونەتە پلەی ئەوە كە نەخۆشی سادیزم(*) تووش بوون . خۆشی و ئارامی دەروونیان

---

★ ( سادیزم = Sadism ) نەخۆشی یەكە ئەوانەی تووشی دەبن خەڵك ئازار دانیان لەلا خۆش دەبێ. پێچەوانەكەی (ماسۆشیزم = Masahism )ە كە لەزەت لە ئازار پێگەیشتن وەردەگرێ .

لـە چەوساندنەوە و ئازاردانی خەڵك دا پێ گەیبوە • بوون بە پسپۆڕی ڕەش و ڕووت چەوساندنەوە •

ئەوەی نەگەیشتبێتە ئەم پلەیە و خـاوەنی ئەو هـەموو ئەزموون و تاقی کردنەوەیە نەبێ لـە خـەڵك چەوساندنەوەدا ، ناتوانێ و نازانێ ناچێتە سـەر ئەوە کە بڵێ : « زەڵام ئەگـەر گوندۆرەی لـە باخـەڵیدا بوەستێ بە کەڵکی مسکێنی نایە »(**) زەلامێك کە حاڵی خۆی وەهابێ لـە ڕووتی و پەرێشانیدا ، دەبێ حاڵی ماڵ و منداڵی و ئەو کەسانەی لە زیان و گوزەرانیان دا بەر پرسیارە ، چ حـاڵێ بێ ؟ زەلامێك ئاوەهـ نەبێ ، بەنانو زگ ، هـەموو شتێك بۆ ئاغـا ناکا ، کەواتە بە کەڵـکی مسکێنی نایە !!

هەڵـگری ئـەو بیروباوەڕە ، قـسـەی وەها دەڵێ کـە مانای ئەوە دەگـەیەنێ کـە ئەو قسانەی لە بارەی چەوساندنەوەوە لە فۆلـکلۆری کوردیدا هەنە ، چەوسێنراوەکان خۆیان نەیان گوتووە ، ئەمان ئەگـەر ئەمـەیان زانیبا خزمـەتی ڕژێمی دەرەبەگایەتی و چەوساندنەوەیان نـە دەکرد • بەڵکوو ئەوقسانە ، پیاوی چاك و کەسانی دادپەروەر کردوویانە و هیچی تر •

نازانم ئەمڕۆ ، بۆ ئەو کرێکارانە دەڵێن چی کە لە کارگای وولاتانی سەرمایەداریدا بـە نا چـاری ئیش دەکـەن و ئـەم ئیش کردنەیان بێ گومان خزمەتی سەرمایەداری تێدایە و بەشی زۆری ڕەنجیان بۆ ئەوانە ، ئایا ئەم کرێکارانەش ، وەك برا چەوساوەکانی پێش خۆیان ، هەست بـە چەوساندنەوەی جینایەتی خۆیان دەکەن یان نا؟ وە ئەو خۆ نیشاندان و

---

★★ قسـەیەکی پێشینیانی سەردەمی رژێمی دەرەبەگایەتییە • وتا ئەم دواییەش دەگوترایەوە •

مانگرتنانەی دژی ئـەو چەوساندنەوە و لـە پێناو نە هێشتنی ئـەو چەوساندنەوەیەی لـەو وولاتانەدا دەکرێن ، ئەوانەش هـەر « پیـاوی چاك و دادپەروەر » لە جیاتی کرێکارەکان و بۆکرێکارەکانی دەکـەن و هەڵدەستن ئـەم جلـکە شڕو ووڕانە لەبەر دەکەن و ڕەنگ و ڕوویان ئاوەها دەگۆڕن و هەڵدەبزرکێنن و خۆیان بـە پۆلیسیئەو وولاتانـە بـە دارکاری کردن دەدەن و داوای ماف بۆ کرێـکارەکان دەکـەن !! یان کرێکارەکان خۆیان هەست بە چەوساندنەوەی چینایەتی سەردەم دەکەن و هـەر خۆشیانن بەم خۆپێشاندان و مانگرتنانەهەڵدەستن ؟

ئەمـە ئەگەر کرێکارەکان خۆیان نەبن ، پیاو دەبێ بسەلمێنی کـە ئەو « پیاو چاك و دادپەروەرانە » لە ڕاستیدا ئەکتەری چاکن !!

لەوانەیە کە من لێرەدا نەتوانم وەکوو کـە خۆمدەمەوێ وەرامی هەموو ئەو بۆچوونانەی ئەوانە بدەمەوە . بۆیە وەرامدانەوەی هەندێکیان بۆ هەلێـکی دیی دوادەخەم . بەڵام بۆ ئەوەی کە ئەو قسانە پیاوی چاك و کەسانی دادپەروەر کردبێتیان ، ڕازیم لەسـەر ئەو قسەیە هەیە کـە ئەو کەسە چاك و دادپەروەرانە ، هەر چەوسێنراوەکان خۆیان بن خـۆ ئەگـەر مەبەستیشیان خەڵـکی دیی بێ ، کـە ئازار نەدیوبن ، ئەوە دەیانگەڕێنمەوە بۆ ناوەرۆکی چەند پەرێگرافێکی پێش ئێستامان و دەڵێم کـە سانی چاك و داد پەروەر هەنە و لەوانەشە حـەز بە یارمەتی دانی چەوسێنراوانیش بـکەن . چـاکی ودادپەروەرییەکـەشیان بـە ڕادەی دیتنیان و هـەست پێ کردنیـانە بۆ چەوساندنەوە و جـەورو ستەم . چ لەسەردەمێکی ژیانی خۆیاندا لە خۆیان کرابی وە چ لە خەڵـکی دیکە کرابێ و ئەوان بە چاوی خۆیان دیبێتیان و کاری تێ کردبن . هـەتا زۆر تر و قووڵتر چەوساندنەوەیان چەشتبێ و دیتبێو هەستیان پێ کردبێ

و کاری تێیان کردبێ ، پیاو چاکتر و دادپەروەرترن وە ئەمانە ئەگەر وەها نەبن نازانن و ناتوانن ئازار و تامەزرۆیی و هەستی قووڵی چەوسێنراوەکان دەربڕن • هەموومان خۆیشان دانەکەی جەماوەری شاری پاریس دەزانینی کە لەبەردەمی باڵەخانەی لویسی شانزەهەمدا داوای نان و هەرزانیان کردبوو ، وە (ماری ئەنتوانێت)ی ژنەکەی پاشا کە لە مەسەلەی ئەو جەماوەرە ڕەش و ڕووتە نەگەیشتبوو ، وە لە ئازاری ئەوان شتێکی نەدەزانی ، (زگی تێر ئاگای لە برسی نی‌یە )(*) ، چۆن گوتبووی « ئەو خەڵکە ئەگەر نانیان دەس ناکەوێ دە با کێك بخۆن !! » •

یان چۆن کوێرێکی زگماك ، بائەمەنی زۆریش بێ ، ناتوانی باسی ڕەنگەکان بکا ، بۆ ئەم مەسەلەیەی ئێمەش کە تا ئێستا لە بارەیەوە دەدوێین ، هەروەهایە • بۆیە ئەو قسانە ، ئەو بەرهەمانە تەنیا لە لایەن چەوسێنراوەکان خۆیانەوە گوتراون و بەڵگەی ئاشکراو بێ دەمەتەقێن لەسەر ئەوە کە لە زۆر دێرینەوە ، لە کوردستان دا چەوساندنەوە بووە •

بیستوومە کە فۆلکلۆریان کردوە بە سێ بەشەوە ، بەڵام نازانم چی نووسەرێکە و ناش زانم چۆنی دابەش کردووە • من لە سەر سێ بەشەکە ڕازیم و بە ڕاستی دەزانم کەسێ بەشە • بەلای منەوە سێ بەشەکە ئەوانەن بەشێکیان خزمەتی بەرژەوەندی چەوسێنراوە و بەش خوراوەکان دەکا ، وەك ئەوانەی کە لەسەرەوە هەندێکیانم خستە بەر چاو • بەشی دووەمیش ، ئەوانەن کە خزمەتی خوێنمژین و زۆرداران دەکا ، وەك ئەوەی کە دەڵێ «نا عیلاج بە جوولەکە دەڵێ بە ڕیشی مەردانەت قەسەم »(١٥)یان « دەسێ کە نە توانم بیبڕم ،

---

★ زگی تێر ئاگای لەبرسی نی‌یە = قسەیەکی پێشینانە •

ماچی‌ده‌کەم • » ( ١٦ ) و هەندێکی دیکەشی • بەشی سێ یەمیش ئەوانەن کە هەر لایەك لە دوولای زۆرانی‌یە چینایەتی‌یەکە ، خوێنمژراوو خوێنمژ ، دەتوانێ بۆ بەرژەوەندی خۆی کەڵکی لێ وەربگرێ • کە زۆربەی فۆلکلۆر لەم بەشەیانە • وەك ئەوە کە خوێنمژراوێك لە کاتی تەنگانەدا دەتوانێ بلێ : ــ « خوا کڵاوی بۆ بەڕووش کردووە » (١٧) ، یان « کەڵە شێریش نەبێ ڕۆژ هەر دەبێتەوە » (١٨) • زۆردارێکیش لە کاتێکدا کە تووشی تەنگانە بێ ، دەتوانێ بە هەمان قسە دڵ خۆشی خۆی بداتەوە •

با فۆلکلۆرەکەمان ، کە سەرچاوەی پاك و ڕوونی رابردوومانە کە تۆماری ڕاستەقینەی هەموولایەنێکی ژیانی ڕابردووی نەتەوەکەمانە و تا ئێستا تۆمار نەکراوە ، خزمەت بکەین ، نەیەڵین دەستی شێواندنی بگاتێ، گەشەی پێ بدەین ، جۆگەی لەبەر هەڵگرین و بۆ خزمەت کردنی ئەمڕۆ و دوا ڕۆژمان کەڵکی لێ وەربگرین و ئەو قسەیەمان هەمیشە لەیاد بێ کە گوتراوە :ــ « تەنیا شۆڕشگێڕی ڕاستەقینە دەتوانێ کەڵکی تەواو لە فۆلکلۆر وەربگرێ » •

**مانگی نیسانی / ١٩٧٧**

# ( سـكالا )

• شەوی ١٩٧٨/٢/١٥ بۆ سەردانی خزمان چوومە قەڵادزێ • کچۆڵەیەکی پۆلی شەشەمی سەرەتایی لە خزمەکانم ، داوای نووسینێکی لێ کردم کە بۆ فوتابخانە پێویستی پێ هەبوو لە ژێر ئەم ناوونیشانەدا • نووسینەکە ئەمەی بەردەستان دەرچوو کە هەر لەو دانیشتنەدا نووسیم • •

• سکالا ، مانای دەربڕینی نارەزایی‌یە بەرامبەر بە شتێك ، جا هەر شتێك بێ ، وە ئەو سکالا دەربڕینە بە هەر ڕێگە و هۆ و جۆر و شێوەیەك بێ •

بە شێوەی قسە ، بە شێوەی شیعر و چیرۆك و پەخشان ، بە شێوەی تەمسیل کردن ، کە ئەمانە هەمووی شێوەی ئاشکراو بێ پەردەی دەربڕینن •• یان لە ناو پارچە یەك مۆسیقەدا ، یان لە ناو تابلۆیەکی نایابدا ـ ئەو جا لە دوایدا ـ پێت دەڵێم کە بۆچی بەو تابلۆیەی سکالا دەردەبڕێ دەڵێم «نایاب» • یان بە شێوەی ڕوو گرژ کردن و چرچ و لوچ خستنە دەم و چاوەوە ، کە ئەمەیان ، سادەترین و ئاسانترین شێوەی سکالا دەربڕینـە •

سکالا ووشەیەکی پڕ لە دەنگ و زەنگ و ئاهەنگ و مۆسیقەی سادەیە ، وا بزانم هەر لە زمانی کوردیشدا ئەم مۆسیقە و دەنگە خۆشەی هەیە و وەها ئاسك و تەنك و شلکە •

دەربڕینی سکاڵا ، بە بێ ئەوەی هیچ پەنا و پێچ و نا ئاشکرایی و ناڕوونی یەکی مەبەستی دەربڕینی سکاڵاکەلێك بدەینەوە و بخەینە بەر چـاو ، هەر خۆی نیشانەی ناڕەزایی و ـ دەردی کوردە کە ووتەنی ـنا شکوری یە بەرامبەر بەو شتەی کە سکاڵاکەی لە بارەیەوە دەر دەبڕدرێ ، ناڕەزایی و ناشکوریش ، کە لەبارەی هەر لایێکی ژیانی گەلێکی دوا کەوتووی وەك ئێمە بێ ، نیشانەی ئەوەیە کـە سکاڵا دەربڕەکە هیوای پێشکەوتن و دروست کردنی بارێکی لە بارتری هەیە • کـــە ئەمەش نیشانەی چـاك بوون و نیشانەی ژیان و نیشانەی جووڵانەوەی پیرۆز دەبەخشێ • هـەر بۆیەش بوو بەو تابلۆیەم گوت «تابلۆی نایاب»کـــە ناڕەزایی و سکاڵا دەردەبڕێ •

خۆزیا هـەموو لایـێکی ژیانی گەلەکەمان خۆش و گـەشاوە و نایاب و جوان و بریسکەدار دەبوو • هیچ لایـێکی وەها نەدەما کـە سکاڵای لە بارەیەوە بکرێ !!• خۆزیا ئەو ئەو ووشـەیە نەك هـەر نـە زمانی کوردیدا نەدەما ، بەڵـکوو لـە هەموو زمانێـکی ئەم جیهانەدا هیچ ووشەیەك نە دەما کەدەقا و دەقی مانای ووشەی (سکاڵا)ی کوردی بداباتە و ژیانی هەموو نەتەوە و گەلێکی ئەم جیهانە خۆش و بەختیارو کامەراندەبوو •

بەڵام ئایا (خۆزیا)ی ڕووت کـە هیچ کردەوەیەکی بە کەڵـکی لەگـەڵدا نەبێ ، کـە دارێك لەسـەر بەردێك دانەنێ ، هیوا و ئاوات و ئامانج دەهێنێتەدی ؟!! • •

# لەگەڵ باسەکەی خا دکتور کوردستان موکریانیدا

**پێشەکییەکی پێویست !**

تێوارەیەك ، ڕۆژ و مانگەکەیم لە یاد نەماوە ، لەسەرەتای ســـالی ١٩٥٤ دا ، لە کۆلیجیقانوون ، لە بەغدا ، (نازك الملائکة) ، خا شاعیری عەرەبی عیراق ، کۆڕێـکی بۆ سازدرابوو ، شیعری خۆی دەخوێندەوە، منیش لە کۆڕە کەدا ، دانیشتبووم ، لە دڵی خۆمدا دەم گوت « کەی دەبێ ئێمەش ـ مەبەستم نەتەوەی کورد بوو ، وەك ئەمە ئافرەتمان تێـدا هەڵکەوێ و کۆڕ ببەستێ و بەوشێوەیە قسەبـکا و شیعربخوێنێتـەوە و خەڵك گوێی لێ بگرێ ؟ » •

ڕۆژگارێـکی دور و درێژ بەســەر ئەو تێــوارەیە دا ڕەت بوو بەڵام وەك دەردەکەوێ ، ئەو خواستە لــە ناو دەروونی مندا جێگایەکی بۆ خۆی هەڵکەندبوو •

بەیانی ڕۆژی (١٩٨٠/٤/٢١)بەشـداراني ميهرەجاني يەکــەمی ڕۆشنیری کوردی لـــە هۆڵەکەدا دانیشتبوون لە هــەولێر منیش لەگەڵیاندا ، میوانێکی بانگ کراوبووم و گوێمان لە ووتارەکــەی خـا دکتور کوردستان ڕاگرتبوو •

لەبەر هەندێ هۆی گشتی و تایبەتی ، تا ئەو بەیانی‌یە ، مـن لە هیچ کۆڕێـکی وەها دا ئامادە نەبوو بووم کە ئافرەتێکی کورد قسـەی تێدا بکا ، یان شیعری تێدا بخوێنێتەوە . لەبەر ئەوە ، ئەو خۆزگەیەی لـە کاتی کۆڕەکەی (نازك الملائكة)دا بە بیرم دا هاتبوو ، هەر گورج لە دانیشتنەکەدا سەری هەڵدایەوە و هاتەوە بیرم ، ئای کە خۆشە ، خۆزگە و ئاواتە گەورە کانیشم بێنەدیی و بە چاوی خۆم بیان بینم ، با دێرو زۆریش بخایەنێ .

لەگـەڵ ئەوەشدا کـە مەبەستم بوو گوێ بۆ ووتارەکە ڕابگرم جاروبار بیرو هۆشم هەر بۆلای ئەو خۆزگـە دێرینە دەگـەڕایەوە و دیمـەنی کۆڕەکەی پێشووم بە هینەکەی بەردەمم بەراووورد دەکرد لەو کاتەدا پسوولە کاغەزێکیان دایە دەستم ، کە لە بەیامنێری ڕۆژنامەی (هاو کـــاری) یەوە‌بوو کەتێـدا داوای نووسینی شتێـکی لەبارەی ووتارەکـەوە لێکرد‌بووم . بێ گومان ـ وەك دەبینن ، حەزم دەکرد هەموو کەلێن و قوژبنێـکی ووتارەکـە بە دڵی من بایە . پێشم خۆش نەبو ئـەم داوایەم لێ کرا ـ نەوەکوو بکەومە سەر کـەمو کوڕی‌و هەڵەکانی ناو ووتارەکە . هەروەها بێ گومان داوا کارەکانیش ئـەم هەستەی منیان نە دەزانی ، دەنا لەوانەبوو ، ئەمداوایەیان لە شاعیر ، یانلە نووسەرێکی دیکە کردبایە .

هـەر لە کـاتی میهرەجانەکـەدا ، نووسینەکەمدایە دەزگای ڕۆشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی . چـاوەڕانم دەکـرد ، لەگـەڵ باسەکـەی خا دکتۆردا ، هەر دووکیـان بەیەکەوە ، لـە گۆڤارێـکی دەزگایەکەدا بلاوبکرێنەوە ، کە چی وا نەبوو . باسەکـە لـە گۆڤـاری (بەیان ـ ژمارە ٦٢ ـ حوزەیرانی ١٩٨٠)دا بلاو کرایەوە ، نووسینەکەی

منی لەگەڵدا نەبوو • ووتم نەوەکا ، نووسینەکەیان لە بیر نەمابێ ، یان کەوتبێتە لایەکەوە ، جارێکی دیکە ، لەگەڵ هۆنراوەی «سیروان»دا نووسیمەوە و بەدەستیی بۆم ناردن • ئەم جارەش ماوەیەکی درێژی بە سەردا تێپەڕی ، هیچ دەنگی نەبوو •

لەو کاتەدا ، لە یەکێتی نووسەرانی کورد ، لە ڕێگەی برادەرایەتییەوە ، داوای بەرهەمێکی لێکۆڵینەوەیان لێ کردم کە لەیەکێك لە ژمارەکانی خولی دووەمی گۆڤاری «نووسەری کورد»دا بڵاوی بکەنەوە • منیش هەر هەمان ئەو دوو بەرهەمەی باسم کردن ، دام بە ئەمانیش و پێم‌ووتن کە ئەم بەرهەمانەم داوە بەدەزگای باس کراوو دەستم لەوە شوشتوە ، کە لێکۆڵینەوەکەیان بڵاوبکەنەوە •

گۆڤاری (بەیان ـ ژمارە ٦٨ ـ کانوونی دووەمی ١٩٨٠ )دەر چوو ، نووسینەکەی تێدا بوو • چەند ڕۆژێکیش لەپاش ئەو ، ژمارەی تایبەتی بە لێکۆڵینەوەی ، نووسەری کوردیش دەرچوو(*) هەمان نووسینی تێدا بوو •

لە لاپەڕەکانی دوایی ئەم گۆڤارەدا ، هەندێ گلەیی‌یان لە یەکێك لە نووسەرەکان کردبوو ، وە پێ‌یان گوتبوو کە ئەو لە پێناو وەرگرتنی پاداشتی نوسین و دەسکەوتنی ناوو ناوبانگ و ••• شتی وەهای‌دیی ، هەڵپە دەکا بۆ بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی لە بڵاوکراوە کوردی‌یەکاندا و ••• هتد • لە دوایی ئەو ووتارەدا ڕستەیەکیشیان ئاراستەی من کردبوو ، وەك لە بیرم مابێ ، دەڵێ : ( هەمان گلەییش ئاراستەی کاك خالید دلێر دەکەین ) •

---

★ نووسەری کورد ـ ژمارە (٦) شوباتی ١٩٨١ / خولی دووەم •

لەبەرئـەوەی لـە شـەوی ١٩٨٣/٢/٢٥ ، لە بارەگـای یەکێتی نووسەرانی کورد لـە سلێمانی ، بە ئامـادەیی دەستەی بەڕێوە بـەری یەکێتی‌یەکە لەسلیمانی و دکتور عزالدین و ... هتد ، کاك محمدی مەلا کەریم ، کە نووسەر و بڵاوکەرەوەی گلەیی‌یەکە بوو لە گۆڤارەکەدا !! داوای لێ بووردنی لێ کردم و دڵنەوایی کردم . لەم بارەیەوە هیچم نەبەر دڵی‌دا نەماو ئەم مەسەلەیە کۆتایی هات .

بەڵام لێرەدا ، زۆر بە کورتی ، هەندێ ڕاستی دەخەمە بەر چـاوی خوێنەرەوە ، بۆ مەبەستی وەرامدانەوەی کاك محەمەد نا ، کە ووتم ئەمە کۆتایی هـات و نەمـا . بەڵـکوو تەنیا بۆ مەبەستی پارێزگـاری لـە خۆکردن ، کە ئەمـە مافێکی ڕەوای هەموو مرۆڤێکە . هەر بایی ئەوەندە کـە ئەو پارێزگاری‌یە لە خۆم بکەم بەرامبەر بە نووسین و بڵاوکردنەوەی ئەوگلەیی‌یە . وە بۆ ئەوەی خەڵك وا نەزانن کە بێ دەنـگیم لە قبووڵ کردن و ڕازی بوونەوەیـە لـەو شتانەی کـە وەپاڵیان داوم وە بـە پێویستی دەزانم کە ئەم چەند ڕستەیەش بنووسرێن و بڵاوبکرێنەوە بۆ دوا ڕۆژ و هیچی‌تر .

داوای لێ بووردنیش لە خوێنەر دەکەم ، چونکە لەم جێ‌یە باشتر و لەبارتر و ئاسانترم بۆ هەڵنەکەوتەوە ، بۆ ئەم بڵاو کردنەوەیە . بە تایبەتی هەر نەبێ لەبەر ئەوە کە ئەوگلەیی‌یە پێوەندی‌یەکی کەمی بە نووسینەکەی من و باسەکەی خا دکتور کوردستانیشەوە هەیە .

لەبەرئەوەش لـە پێش دیتنەکـەی کاك محەمەد وەرامم نەدایەوە ، چونکە جێگایەکم شك نەدەبرد ، گۆڤاری نووسەری کوردیشیان لەگەڵدا بێ ، کـە ئەو وەرامدانەوەیەم بۆ بڵاوبکاتەوە . ئەمجا دەڵێم :

• بۆ هەڵـە کردن لە بڵاوکردنەوەی بەر هەمەکانم ، دەتوانم خـۆم

لەو کەسانە بژمێرم کە کەمترین هەوڵ دەدەن و دەرفەت وەدەست دەخەن بۆ ئەم مەبەستە • بەڵگەشم لەم لایەنەوە گەلێ زۆرە ، ئەمانە هەندێکیانن:ــ

١ ـ ماوەی نزیکی سێ ساڵ ڕۆژنامە نووس بووم ، کەمترین بەرهەمی وێژەییم لەو ماوەیەدا بڵاوکردۆتەوە ، هەروەها لە گۆڤاری ڕزگاری‌دا ، کە دەمتوانی زۆرترین بەرهەمی لەو بابەتەیان تێدا بڵاوبکەمەوە • لەم بارەیەوە نەك هەر هەڵپەم نەکردوە ، بەڵکو دەیەکی ئەو دەرفەتەم نەقۆستوەتەوە کە لەبەردەستم دابووە •

٢ ـ لە هەموو ماوەی خولی دوور و درێژی یەکەمی گۆڤاری نووسەری کورد دا لەگەڵ ئەوەشدا کەمن یەکێك بووم لە ئەندامانی دەستەی دامەزرێنەری یەکێتی‌یەکە ، تاکە یەك بەرهەم چی‌یە ، هی منی تێدانی‌یە • یەکەمین بەرهەمم کە لەو گۆڤارەدا بڵاوکرابێتەوە، ئەو نووسینەیە ، کە گلەیی‌یەکەم لەسەری بۆ ئاراستە کرا • پاش ئەوەش یەك هۆنراوە «سیروان» یشم لەو گۆڤارەدا بۆ بڵاوکراوەتەوە • ئەگەر ئەمە هەڵپەکردن نەبێ • ئەدی گوایا چی‌شتێك هەڵپەکردنە ؟!

٣ ـ لە هەموو گۆڤار و ڕۆژنامەکانی سەردەمی نێوان (١١ی ئازاری ١٩٧٠) وە هەتا (مانگی نیسانی ١٩٧٥) ـ کە هۆنراوەیەکم لە گۆڤاری بەیاندا بڵاوکردەوە کە دەکا ماوەی زیاتر لە پێنج ساڵ ، لە سەرجەمی گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا ، یەك بەرهەمی منیان تێدا نی‌یە• ئەمە لەبەرئەوەنا کە ئەوان بۆیان بڵاونەدەکردمەوە ، بەڵکوو لەبەر ئەوە کە من بەرهەمم بۆ نە دەناردن •

بۆ پاداشت وەرگرتنیش ، هەروەها دەتوانم بڵێم لە ناو هەموو شاعیر و نووسەرەکانی کە لە پلەی من دان ، کەمترین پاداشتی دراویم لە بڵاوکردنەوەی بەرهەمی وێژەیی دا وەرگرتووە ، ناڵێم پاداشتی ڕێز لێنان و باڵ پشتی گرتنی بۆ چوونەکانم و لەم جۆرە شتانە ۰ تا کاتی ئاراستە کردنی ئەو گلەیی‌یە بۆم لە نووسەری کورد دا ، هەموو ئەو پاداشتە دراوی‌یەی من لە هەموو ژیانم‌دا لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا وەرم گرتووە (ـ۲۷) دینار ، تەنیا بیست و حەوت دینار بوو ۰ حەوت دیناریان لە ڕۆژنامەی عیراق ، ئەویتریش لەگۆڤاری (بەیان) ۰ لەوانەیە بەڵگە نامەی پارە وەرگرتنەکان مابن ، ئەوی بڕوانەکا دەتوانێ پێیاندا بچێتەوە ۰ بە ڕاستی ئەو بەڵگە نامانە شتی بە نرخن و زۆر شتی سەیر بۆ خەڵك دەر دەخەن ۰ هیوادارم لەناو نەدرێن و بمێنن ۰

جا کە من ئەوانەی سەرەوە هەڵویستم بووبێ ، وابزانم هەر ئەو دوو هەڵوێستە ، بەتایبەتی هەڵپە نەکردنم بۆبڵاوکردنەوەی بەرهەم و بەشداری نە کردنم لە زۆر کۆنگرە و میهرەجانی وێژەیی‌دا کە تیایاندا بانگ کراوم ، وا بزانم بەسە بۆ ئەوەی‌خوێنەواری بەڕێز دڵنیابێ لەوە دا کە من هەڵپە ناکەم بۆ ناوبانگ و شتی لەم تەرزە بابەتە ۰ هەر ئەمەندە دەڵێم و هیچی‌تر ۰ بۆ دوا ڕۆژ ، بۆ مێژوو ۰ جارێکی دیکەش داوای لێ بووردن لە خوێنەر دەکەم بۆئەوە کە ئەم پێشەکی‌یە زۆر درێژ بۆوە ۰ ۰ ئەمجا با بێینە سەر خودی نووسینەکە :ـ

لە بەیانی ڕۆژی دووەمی میهرەجانەکەدا ، (۱۹۸۰/٤/۲۱) ، خا دکتور کوردستان باسێکی جوانی بە ناوی (دەنگی ئافرەتی کورد لە نێو هۆنراوەکانی‌دا) پێشکەش بە بەشدارانی یەکەم میهرەجانی ڕۆشنبیری کورد کرد ۰ منیش لەسەر داوای پەیامنێری ڕۆژنامەی (هاو کاری) ، کە

له کاتێکی کەم دەرفەتی دا ، داوای نووسینی شتێکی لێ کردم لەسەر باسەکەی خادەکوردستان ، وا ئەم چەند لایەنەی خوارەوە پێشکەش بە خوێنەری کورد دەکەم ، ئومێد دەکەم ئەو کاتەی لێ بە فیڕۆ نەدەم کە تیایا دەیخوێنێتەوە و دکتۆریش دڵی نەیەشێت چونکە من باری سەرنجی خۆم تەنیا لە ڕووی بەرزەوەندی مەسەلەی ئافرەتەوە دەخەمە ڕوو ، کە بەرژەوەندی میللەتەکەشمانە •

جارێ پێش ئەوەی بچمە ناو باسەکەوە ، ئەمە تان عەرز بکەم ، کەوا لەمەوبەر بە ژنە دەرەبەگ و بەگزادە و شێخە زل و خوێنمژەکان دەگوترا (فلان خان) • بەلام ووشەی (خاتوون) کە کورتیش دەکرایەوە، دەبوو بە (خاتوو) بەو ئافرەتانە دەگوترا کە دەست ڕەنگین و هێمن و کەیبانووی باشی ماڵی خۆیان بووون ، زور جار خاتووەکەش کورتتر کراوەتەوە و بووە بە ( خا فلان ) وەك ( خا فاتم ) ، (خا بەسێ) و ••• هتد • جا بۆئەوەی بزانین کە فلان دکتور ، یان ئەندازیار ، ئافرەتە یان پیاو ، بەتایبەتی کە ئێستازۆر جار ناوەکەش ئەمە دەرنا خات ، خراپ نی‌یە کە ووشەی (خا دکتور)یان (خا مامۆستا) ، (خا ئەندازیار) لە پێش ناوەکەدا بەکار بهێنرێ ، ئەم ڕایەم بە ڕاست زانی ، بۆیە لەسەرەوە بەم شێوەیە ناوی دەکوردستانم برد • کە ئەمە یەکەم جارە ، ئافرەتێکی کوردی خاوەن ئەم جۆرە شەهادە بەرزە بەم شێوەیە ناوی ببرێ • خۆشتر دەبوو کە ئەم پێشنیازە لە لایەن ئافرەتێکەوە پێشکەش بکرایا •

خا دکتور کوردستان لە باسەکەیدا چەند جارێك ووشەی (خان)ی بە گەڵ ناوی شاعیرە ئافرەتەکان داوە ، وەکوو ئەوە گووتویەتی (نەجیبە خان) ، (مەهرەبان خان) و ••• تاد • دەبوو خا دکتور دڵی بڕوایی نەدا ئەم ووشەیە وەپاڵ ئەوان بدا و شایانی ئەوانی نەبینێ و لە

پێش ئێمە و ماناندا بیر لـە بەلاوە نانی ووشەی (خان) ی بەد فەســاڵ بـکانەوە !!

هــەر لـەم بارەیەوە ، ئەمــەش عەرز بکەم کە لە ناوچەی کۆیە و پشدەرایەتی و موکریانیش ووشــەی (یا ، یای)بۆ ڕێز نان لە ئافرەت بەکار دەهێنرێ و بە مانای خوشکی گەورە دێ •

بێ گومان هەندێ کەس دەپرسن و دەڵێن :ـ

باشــە ئەم نیشانەی لەیەك جیـا کردنەوەی ئافرەت و پیـاو بۆچی هەبێ ، مادام کە ئێمە بڕوایمان بە یەکسانی‌یان هەیە ؟ لە وەرامدا دەڵێم جیاوازی لە نێوان ئافرەت و پیاوی کورد دا بە چەشنێك هەیە و زۆرە کە خۆ لێ هەڵە کردنی تاوانێکی گەورەیە • چارەسەرکردن و نەهێشتنی ئەو جیاوازی‌یانە بەوە نابێ کە بشاردرێنەوە ، بەڵکوو بەوە دەبێ کـە خـەباتی زانستیانە و گونجاو لە پێناویاندا بکرێ •

باسەکەی خا دکتور ، باسێکی بەکەڵکە • هەندێ مەسەلەی گرنـگی تێـدا خستووەتە ڕوو • بەڵام بە پەلە ، لە شتێکەوە بازی داوەتە ســەر شتێکی تر ، بێ ئەوەی مافی تەواو لە شی کردنەوە و ڕوونکردنەوەیان بداتێ • هــەندێ مەسەلەی زۆر بنەڕەتیشی هەر باس نەکردوە • ئومێد دەکەم ، هۆی ئەمانە ، کـەم دەرفەتی‌ی بووبێ و لە پێش چاپ کردنی دا ، بە شێنەیی چاوێـکی پێدا بخشێنێتەوە •

ئەو خاڵانەی لەم سەرنجدانە خێرایی‌یەدا بەر چاوم کەوتن ، کـــە بەلای منەوە دەبێ لێ یان بدوێم ، ئەمانەن :

١ ـ ناوو نیشانی باسەکە ، کـە مەبەستی بەرهەمی ئافرەتە بـە گشتی لەگـەڵ ناوەرۆکەکەی‌دا نا گونجێ • ئەمیـان زیاتر پێوەندی بـە

بەرهەمی خا دکتۆر خۆیەوە هەیە • ئەگەر بەرهەمی خا شاعیر (خانم) نە ژمێرین ، کە چوار جار نموونەی لێ هێناوەتەوە ، ئەو نموونانەی خا دکتور لە هۆنراوە کانی خۆیدا هێناوەتیەوە بە تەنیابە ژمارە بەرامبەر هەموو ئەو نموونانەیە کە هی هۆنراوەی شاعیرە ئافرەتەکانی ترە • ئەگەر ناوونیشانی باسەکەی ( دەنگی ئافرەتی کورد لە نێو هۆنراوەکانی دەکوردستان موکریانی و شاعیرانی دیکەی ئافرەتی کورد دا)بایە گونجاو تر بوو •

٢ ـ لەو مەسەلە گرنگانەی هەر باسی نە کردوون یەکێکیان هۆنراوەی نیشتمانییە لە بەرهەمی ئافرەتدا • خا دکتور خۆشی لە وەرامی پرسیارێك دا کە لە پاش تەواو بوونی خوێندنەوەی باسەکەدا ، ئاراستەی کرا ، دانی بەوە دا نا کە زۆربەی بەرهەمی هۆنراوەی ئافرەتە شاعیرەکانمان هۆنراوەی نیشتمانییە • باشە کە ئەمە دەسەلمێنێ بۆچی لە باسە کەیدا ، تەنانەت هەر پەنجەیەکیشی بۆئەم ڕاستییە درێژ نەکردبوو ؟!

٣ ـ باسی لایەنی ئابووریشی نەکردوە کە تا چ ڕادەیەکی زۆر و سەرەکی کاری کردۆتە سەر بەندەگیەتی و دیلیەتی ئافرەتی کوردستان • لەو شەش کۆمەڵە هۆنراوە چاپکراوەی ئافرەتانی کورد و ئەو هەموو فۆلکلۆرەی کە بە ناوی ئافرەتەوە ، یا لەلایەن ئافرەتەوە گوتراوە و لە شیعرەکانی خۆشیدا ، خا دکتۆر دێڕە هۆنراوەیەکی دەست نەکەوتووە ، بیکا بە بەردەبازی ئەو ڕێگایە و بۆی بپەڕێتەوە و هەر نەبێ هەندێ ئەم لایەنە گرنگەش باس بکا ؟ لەبەر ئەوەی من بۆی نەگەڕاوم ، بۆیە ئەمە وەکوو پرسیارێك

ئاراستەی خا دکتۆر خۆی و خوێنەران دەکەم • پێویستە و دەبێ ئافرەت تێ بگەیەندرێ کە سەربەستی ئابووری بنچینەی هەموو سەربەستی‌یەکانی دیکەیەتی‌ی • گەرەکە ئافرەتی دەشتەکی بزانێ کە ئەو توزقاڵە سەربەستی‌یەی لە لادێ‌یەکانی کوردستان‌دا هەیەتی و لە تۆی عەباو پەچە هاتۆتە دەرەوە ، بە هۆی ئەوەوەیە کە ئیش دەکاو بەرهەمەی ئابووری وە دەست دەهێنێ • ئەو ئافرەتەی ئەو هەموو ئیش‌و فرمانە لە لادێ دا بەجێ بهێنێ ، پیاوەکان و گەورە کانیان ناتوانن دەم و چاو و دەست و قاچیان بە پەچە و عەبابەستەوە !! هەروەها دەبێ ئافرەتی شارەکانیش ئەوانەی دکتور و ئەندازیار و مامۆستا و فەرمانبەر و کرێکاری میرین ، تێ‌بگەیەنرێن و تێ‌بگەن ، کە ئەو سەربەستی‌یەی بۆئیش کردن ، بە مەبەستی پارە پەیدا کردن هەیانە ، بۆ هاتو چۆکردن و گەڕان نیانە هەر لەگەڵ هەمان کوڕ و پیاوانی دایرە ، یا کارگا کەیاندا ، کە بە ڕۆژ ، شەش حەوت سەعات بۆ پارە پەیدا کردن لەگەڵیاندان • زۆر مەرجە کە ئافرەت بەگشتی و بە ڕوونی بزانن کە لە ژێر سایەی ڕژێمێکی ئابووری سوشیالیستی زانستی‌دا نەبێ ، لە هەموو ڕوویەکەوە یەکسانیان لەگەڵ پیاو دا محاڵە و خەیاڵە •

بەلای منەوە نەدە بوو ، وە ناش بێ لەباس کردنی هەر لاێکی بەرهەمی ئافرەت ، یا هی ژیانی ئافرەت ، مەسەلەی ئابووری و پێوەندی بە ئافرەتەوە بخرێتە پشت گوێ‌وە •

٤ ـ خا دکتور ، باسەکەی ئابلووقە داوە بە بەرهەمی شاعیرە ئافرەتە ناسراوەکان (مەبەستم نا فۆلکلۆری‌یە) ـ هەڵنەستاوە لە جیهانی

هۆنراوەی فۆلکلۆری نەتەوەکەماندا ، هەندێ نموونە لە شیعری ئافرەت بهێنێتەوە لە بارەی ئەولایەنانەوە کە لێیان دواوە • بێ گومان لە لاوك و حەیران و هۆنراوە و بابەتەکانی دیکەی فۆلکلۆری دا گەلێ نموونەی وەهامان دەسدەکەوێ • بۆ نموونە لە لاوکی «گەنج‌خەلیل»دا کە هونەرمەندی بە ناوبانگ ( کاوەیس ئاغا ) ووتوویەتی ، ئەو دیمەنە پڕ لە سۆز و هەستی نیشتمانی و کوردایەتی و خۆشەویستی‌یەی کچە کە بە خەیاڵ «گەنج خەلیل»ی ئامۆزای خۆشەویستی‌ی بەند کراوی ڕۆمیان ، لە بەندێ دێنێتە دەرەوە ، پێی دەڕازێنێتەوە ، نەوەکا ڕۆمیان بیژن : « **گەنج خەلیل » سوارەکی کوردە ، چەندی بێ کاروبارە »** چ شاعیرێکی ئەم سەردەمە ، ئەم جۆرە بەرهەمەی لەبەردەست دێتە دەر ؟ مـن وای بۆ دەچم کە هۆنراوەی ئەم لاوکە فۆلکلۆری بێ •

ئەگەر خا دکتور ، ئەمەی بکردبایە و هەندێ خۆی ماندووتر بکردایە ، باسەکەی قووڵتر و فرەوانتر دەبوو •

٥ ـ خا دکتور ، لە یەك دوو جێگای باسەکەیدا ، پاکانە دەکا بۆ لاسایی نە کردنەوەی هۆنراوەی پیاوان لە لایەن خا شاعیرەکانەوە !!• لەم لانەوە دەڵێم لەبەر ئەوەی ئافرەت و پیاو لـە یەك بارو جۆری ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و ••• هتـدا دەژین کـە لە بەشی کوردستانەکەی لای خۆماندا هەیە ، وە بەرهەمی ویژەییش چ هی ئافرەت بێ و چ هی پیاو ، ڕەنگدانەوە و ئاوێنـەی هەمـان جۆر و باری ژیانە و هەر دوو بەرهەمەکە ئاوی یەك سەرچاوەنەو ( بانێك و دوو هەوا )[١٩] نی‌یە • بۆیە دەبێ بەر هەمی هۆنراوەیان و ••• هتد لە یەك بچێ • وە لەبەر ئەوەی پیـاو کۆت و زنجیری بیر و

دەست و قاچی کەمتر و باریکترە لە هی ئافرەت ، بێ گومان دەبێ بەرهەمی وێژەیشی‌ی بە هێزتر و بە پێزترێ • بۆیە ئەم بارە بەسەر ئافرەتدا دەسەپێنێ کە لاسایی بەرهەمی پیاو بکاتەوە • هەر کەسێك بڵێ کە ئەو لاسایی‌یە ناکرێتەوە ، دەبێ گوناهی ئەوە وەباڵ ئافرەت بدا کە لە بەرهەمی چاکی پیاو ناگا ، یان هەوڵ نادا پێش بکەوێ ، کە ئەمە گوناه وەباڵ دانێکی ناڕاست و نا ڕەوایە و ئافرەت لە هەموو ڕوویەکەوە چاك و خراپ دەناسێ • بۆیە بەلای منەوە ئەو لاسایی کردنەوەیە دیاردەیەکی زۆر ئاسایی و سروشتی و چاوەڕوان کراوە • ئەم پاکانە کردنە بۆ لاسایی نەکردنەوە ئەگەر لە لایەن یەکێکی دیکەوە بکرابایە ، لەوانە بوو بە سەرنج درشتی‌ی بۆ بژمێردرێ ، بەلام بۆ یەکێکی وەك خا دکتۆر بە هەڵە دەدرێتە قەڵەم •

٦ ـ لە چەند جێگایەکی باسەکەدا ، هەندێ ڕاستی لە بارەی ئافرەتەوە ، بە تەواوی یان بە نا تەواوی باس کردوە وەك ئەمانە خا دکتۆر دەڵێ •

أ ـ ئافرەت بە شێوەیەکی قووڵتر و فرەوانتر و هەست پێ‌کراوتر باسی ووشەی (سەربەستی) خۆی دەکا • ئافرەت سەربەستی خۆ ڕازاندنەوە و خۆ جوان کردن بە سەربەستی ڕاستەقینە نازانێ • چونکە ئەم جۆرە سەربەستی‌یەی تەنیا بۆ ئەوەیە ( ڕاست تر وابوو بڵێ «تەنیا بۆ ئەوە ئەدرێتێ» )زیتر پێ‌ی ڕابوێرن •

ب ـ پێویسته ئافرەتی كورد به تایبەتی ، وه ڕۆژ هەڵانی به گشتی له بەرهەمی هۆنراوەیاندا خەم و سۆزی دڵ و دەروونیـان ئازایانـەتر و چـاو نەترساو تر دەربڕن بۆنەوەی خـۆیان نوێنەری دەنگی خۆیان بن • له دوایشدا دەڵێ :**وه پیاو لـه بریتی ئەوان دەنگی هەڵنەبڕێت • من لەگەڵ ناوەرۆكی ئەم** ڕستەیەی دوایی‌دا نیم • بەلای منـەوه دەبێ پیـاو دەنگ بۆ مەسەلەی ئافرەت هەڵبڕێت و ئافرەتیش دەبێ دەنگ بۆ مافی خوراوی پیاو بەرز بكاتەوه چونكه وەك لەسەرەوه ووتم هەر دوو ڕەگـەزەكه لەیـەك نیشتماندا دەژین و بەرەو ڕووی هەمان مەسەله و گیروگرفتن • بۆ دەبێ بەم شێوەیه لەیەك جیا بكرێنەوه به تایبـەتی لەلایەن یەكێـكەوه كـه حـەز بكا یەكسانی و چوونیەكی‌ی له نێوان ئافرەت و پیاودابنیات بنرێ ؟ شایانی گوتنەوه و ڕێز لێ نانـــه كـــه خا دكتور ناوەرۆكی ڕسته درێژەكەی سەرەوەی جەخت كردۆتەوه و دەڵێ خۆی خاوەن كێشەكەیه ( مەبەستی لـه مەسـەلەی جیاوازی ئافرەته لەگـــەڵ پیـــاودا ) هەروەهـــا دەڵێ سەربەستی نادرێ و دەسەندرێ ، واته سەربەستی ئافرەت دەبێ ئافرەت خۆی بیسەنێ •

(ج) چەند جوانی ووتوه كه دەڵێ :« **بەرهەمی هۆنراوەی ئافرەتی كورد پێویستی به لێكۆڵینەوەی زانستیانه هەیه** » وه ئەگەر هاتبایه ئەم ڕستەیەی خوارەوەی بخستبایه سەری ، ئەوەندەی دیكه جوان و ڕاست و دروست تر دەبوو « بێ گومـان بەرهەمی هۆنراوەی پیاوەكانیشیان هەروەها » • داوا دەكەم

بۆ گرنگی‌دان بەو ڕستەیەی سەرەوەی خا دکتور خەتێـکی لە ژێر دا بکێشرێ •

٧ ـ لەو هەموو دەرفەتەی کە هـەی بووە چەنـد ڕسـتەیەکی نەنووسیوە کە ڕاستەو خۆ ئافرەتان ئاراستە بکا ، کە بە زیرەکی‌و ژیری و هێمنی‌ی و وورپایی و دڵسۆزی و فیداکاری و لە خـۆ بوردنیان بۆ مەسەلە گرنگەکانی گەلەکەمان و قۆناغەکانی ژیانی ، جێ پـێ‌ی خۆیان لە ناو کۆمەڵدا بکەنەوە و لەگەڵ ژیاندا زۆران بکەن •

جارێـکی دیکەش ئومێد دەکەم خا دکتور کوردستان موکریانـی دڵی لە نووسینەکەم نەڕەنجێ و هیوای پێشکەوتنی بۆ دەخوازم • سوپاسی بەیامنێری (هاوکاری)ش دەکەم کە ئەو هەلەی بۆ ڕەخساندم کە ئەم وونارەی تێدا پێشکەش بە خوێنەران بکەم •

هەولێر ١٩٨٠/٤/٢٢

**بەیانی ڕۆژی ( ١١-٢-١٩٨٢ ) کاك لەتیف هەڵمەتی شاعیر ، نێردراوی مەکتەبی سلێمانی - دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی لە وەزارەتی ڕاگەیاندندا : ئەم پرسیارانەی بۆ هێنامە دایەرە منیش وا لێرەدا ، دەقی پرسیار و وەڵامەکانم دەخەمە بەرچاوی خوێنەرانەوە ٠**

**ئەو پرسیار و وەڵامانە لە گۆڤاری ( بەیان - ژمارە ٨٢ی مانگی ئابی ١٩٨٢) دابڵاوکرانەوە ٠**

س١ خالید دلێر شاعیرێکی ناسراوە ، بەڵام حەز دەکەین ، خۆتان زیاتر خۆتان بە خوێنەری شیعرەکانتان بناسێنن ؟

٢ - ئەگەر ڕەخنەگر بن ڕاتان دەربارەی شیعرەکانی خالید دلێر چی دەبێ ؟

٣ - ڕاتان چی‌یە دەربارەی شیعری کوردی بە شێوەیەکی گشتی ، چ شیعری کۆن و چ شیعری نوێ ؟

٤ - ڕاتان چی‌یە دەربارەی ڕەخنەی کوردی بە شێوەیەکی گشتی چ ڕەخنەی سالآنی سەردەمی لاویتان و چ ڕەخنەی هاو چەرخ ؟

٥ - ڕاتان چی‌یە دەربارەی تەموژ لە ئەدەبدا ؟

٦ - چەند بەرهەمتان لە چاپ داوە و بە لای خۆتانەوە جوانترین بەرهەمتان کامەیە ؟

٧ ـ پرۆژەی ئەدەبی داهاتووتان چی‌یە ؟

٨ ـ لەم سەردەمەدا گەلێ ڕێبازی ئەدەبی پەیدا بووە و لە ئەورووپاوە بە وولاتی ئێمــــە گەیشتووە ••• ڕاتان چی‌یە دەربارەی لاســـایی کردنەوەی کوێرانەی ئەو جۆرە ڕێبازانە ؟

٩ ـ چۆن تەماشای شیعری پەخشان دەکەن ؟

١٠ـ جگە لە شیعر هیچ بەرهەمێکی کەی ئەدەبی یا هونەریتان هـــەیە و ••• ئایا دەکرێ لەو لایەنەوە چمکێکمان بۆ ڕوون کەنەوە ؟

١١ـ ئەدەبی کوردی بە گشتی ، لــە چــاو ئەدەبی جیهانی دا لــە چ ئاستێکدایە (بەتایبەتی‌شیعر) ؟•

١٢ـ تکایە وێنەیەکی خۆتان لەگەڵ وەڵامەکاندابێ !

**وەرامی پرسیاری یەکەم**

لەبەر ئەوەی ، وەرامی ئەم پرسیارە ، لەگۆڤاری (بەیان)ی ژمـارە باس کراودا بڵاونەکرایەوە ، منیش بڵاوکردنەوەی بۆ دەر فـــەتێـکی دی هەڵدەگرم •

**وەرامی پرسیاری دووەم**

شیعرەکانی ـ خالیددلێر ـ بەلای منــەوە ! ! ـ ئەم تایبەتی‌یانەی خوارەوەیان تێدا هــەیە ••• ، ناڵێم ئەمانە تەنیــا تایبەتین بە شیعرەکانی ئەوەوە • هەر خــاسەتە ، کەم یا زۆر لە شیعری شاعیرەکانی دیــکەشدا هەیە • بەڵام هەموو خــاسەتەکان بە کۆمەڵ وەك لە شیعرەکانی ئــەم دا کۆبوونەتەوە ، لە هی شاعیرەکانی دی دا کۆ نەبوونەتەوە • جــا من لە خوارەوە دەیانخەمە بەر چاوی خوێنەوارانەوە ، چونکە بڕیاری ئەوان ،

خۆیان ، چ بە تاك و چ بە کۆمەڵ نرخی ڕاستەقینەی شیعرەکانی دلێر دەر دەخەن لەگەڵ ڕەچاو کردنی کات و شوێندا •

لە پێش ئەوەی بچمە سەر باس کردنی تایبەتی‌یەکانی شیعرەکانی ئەو ، با بە بیری خوێنەرانی بهێنمەوە کە لە زووەوە گوتراوە : «کەس بە دۆی خۆی ناڵێ ترشەەوە لەوانەیە ئەم قسەیەی پێشینانە منیش بگرێتەوە !!

١ ـ شیعرەکانی بەیەك شێوە زمانی تایبەتی نەنووسراون • بە کوردی یەکی تێکەڵ لە زۆربەی شێوە کوردی‌یە جیا جیاکان نووسراون ، ئەمە بەبێ ئەوەی بۆ ئەم مەبەستە زۆر لە خۆی بکا •

٢ ـ لەگەڵ ئەوەشدا کە دلێر شیعری تازە ، ئەوەی پێی دەڵێن ، «شیعری سەربەست»ی زۆرە و لە پایزی ساڵی ١٩٥٩ وەئەم جۆرە شیعرەی بڵاو کردۆتەوە ، بەڵام هەر جۆنێ بێ شێوەی شیعری کلاسی بەسەردا زاڵە •

٣ ـ بە شوێن دروست کردنی وێنە و تابلۆی جوان دا ناگەڕێ کە بە شیعر دروستیان بکا و زۆر بۆ ئەم مەبەستە خۆی ماندوو ناکا • ئەمەش زۆربەی لەوە وە هاتووە کە شیعر بەلای ئەوە وە چەکی خەباتە ، چەك گرنگ نیە جوان بێ ، گرنگ ئەوەیە کاریگەربێ •

شیعر بەلای دلێرەوە لە پێش ئەوەی تابلۆبێ ، بیروباوەڕ و جۆری سەرنج و ئامانج و هەڵوێستە • ڕەچاو کردنی ئەم ڕاستی‌یە تا مەودایەکی باش ، دلێر لە ڕیزی شاعیرە کلاسی‌یەکان دوور دەخاتەوە •

٤ ـ شیعرەکانی لە ڕیزی هەرە پێشەوەی شیعری نیشتمان پەروەری و شۆڕشگێڕیی ساڵانی شەست و هەفتاکانەوەنە • دوژمنداریەتی کردنی ئیمپریالیزم و داگیر کردن و کۆنەپەرستی و چەوساندنەوەیان بە زەقی تێدا دیارە •

٥ ـ لە شیعرەکانی دا ، کەڵك لە کەلەپووری خۆمانە (وەك قسەی پێشنیان و •• هتد)و هی گەلانی دیکەش وەردەگرێ • بە لایەوە وایە کە ئەمانە ئەنجام بە چاکی و بە خێرایی دەدەن بە دەستەوە، بە تایبەتی کە کۆمەلانی خەڵك تاقی کردنەوەی تایبەتی و ڕۆژانەی ژیانی خۆیان لەگەڵ ئەو کەلەپوورانەدا هەیە •

٦ ـ ڕەمز و تەم و مز و مەبەست شاردنەوە لە توێی گەلا سلق و قاپلکە پیاز و باینجاندا بەکار ناهێنێ ••• بە لای ئەوەوە شیعر یابراغ لێنان نیە کە بەبێ پێچانەوە نەکرێ • ئەگەر شیعر بۆ کۆمەلانی خەڵك بنووسرێ نابی شاردراوەبێ ، دەنا ئەومەبەستەی کە لێی ڕەچاوکراوە نایەتەدیی ، یان درەنگتر دێتە دیی •

٧ ـ شیعرەکانی بە پێزن و زۆر شتیان تێدایە ، بە تایبەتی لەبەر ئەوەی کە پشت بە زانستی و فەلسەفەی زانستی دەبەستێ بۆ پاڵ پشتی کردنی بۆ چوونەکانی خۆی • ئەم ڕاستی‌یە لە شیعرەکانی دلێر دا زۆر ئاشکرا و ڕوونترە تا لە شیعری بلاوکراوەی شاعیرەکانی دیکە دا • بۆیەش یەکێك لە ڕەخنەگرەکان دلێری بەو شاعیرە داناوە کە دەرگایەکی تازەی بەرەو ڕووی شیعری کوردی کردۆتەوە ، کە ئەویش دەروازەی فەلسەفەی

زانستی‌یه[20] • جـا لەگـەڵ ئەوەشدا کە شیعرەکانی تا ئەو ڕادەیە کە دەرفەت هەبێ ڕوون و ئاشکرا دەنووسێ ، لەبەر ئەو هۆیە هەندێ لە خەڵك هەر بەسانایی‌تێی ناگەن •

جـا لەم وەرامدانەوەیەدا ، ئەگـەر لانی چاکی و باشیم لە شیعرەکانی دڵێر دا زاڵ کردبێ بە سەر لانی کەم و کوڕی و لاوازی یاندا ، ئەوا لە پێشەوە باکانەم بۆ خۆم کرد • لە دوایی هێنان بە وەرامی ئەم پرسیارەدا ئەم قسەیەی پێشینان دەهێنمەوە کە گوتوویانە « ئەگەر کچ بە پێی مەدحی دایکی بێ خاڵ بۆ خۆی دەیخوازی !! »(*) •

**وەرامی پرسیاری سێیەم**

شیعری کوردیش وەك کورد خۆی ، بە تایبەتی چەوساوە و زۆر لێکراوەکەی ، قارەمانە ، نەبەزە ••• خۆ گرە ، هیوای ژیان و ووزەی تێکۆشـان و تاسـەی دڵداری تێدایە • بـە تایبەتی ئـەو شیعرە ڕیالیزمەی کە ئاوێنەی ژیانی ئەو چینە ئێشکەرانەیە • لە هەموو سەختی و تەنگانەیەکدا ، خۆی دەپێچێتەوە و ئـەو لایەن و ئەندامانەی لەشی ، کـە سـەرما بردەڵە و لاوازن و بەرەو گەردەلوولەکە دەکەون ، خڕ و گرمۆڵەیان دەکـاتەوە و دایان دەپۆشێ و خـۆی کۆ دەکـاتەوە بۆ قۆستنەوەی هەر هەلێکی بووژانەوە و خـۆ کردنەوە و گەشە کردن و پێشکەوتن کـە لە ئەنجامی باری خودی خۆی و دەوروپشت ( الظرف الذاتي والموضوعي)دا دەڕەخسێ •

بەڵـگە لەسەر ئەم ڕاستی یانـەی سەرەوە زۆرن ، لێرەدا بـە تایبـەتی تەنیا یەك بەڵگەیان دەڵێم کـە زۆر سادە و ئاشکرایە و لەبەر

---

★ قسەیەکی پێشینانە •

چاوی هەموو مانە ، ئەویش ئەوەیە کە ئەدەبی کوردی بە گشتی و شیعری کوردی بە تایبەتی ، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەو هەموو دوژمنەی هەیە و ئەو هەموو بارە نالەبارانەی بەسەردا تێدەپەڕێ ، هەرماوە و سەر بەرزە و وورەی زۆران گرتن و تێکۆشانی بەر نەداوە . کە ئەم ڕاستی‌یەش زۆر بەی بەری درەختی ڕەسەنایەتی ئەدەب و شیعری کوردی و باری خودی خۆیەتی (الظرف الذاتی)تا ئەوەی هەی هیچ شتێکی دیی بێ . ئەم بارە خودی خۆیی‌یە گەلێ لە بارەکانی دەورویشت بە هێز تر بوون کە جارو بار ، بەرێکەوت بۆی هەڵکەوتووە و تاوێ لە ژێر سایەیدا حەساوەتەوە و پشتێکی بۆ بەرزکردۆتەوە .

ئەم ڕەسەنایەتی‌یەی شیعری کوردی ، لە پێش هەموو شتێکی دیی ، هۆبووە بۆ مانو بۆ جاروبار بووژانەوەی خۆی و ئەدەبی کوردی بە گشتی‌ی . هیچ کاتێ وێژەوانی کورد بە وێژە و شاعیری کورد بە شیعرەکانی نە ژیاوە و تەنانەت ئەمڕۆش . زۆربەی جاریش لەسەر شیعر نووسین و دەست گرتن بە ئەدەبە کەیەوە ، لەقە لە نانی دراوە و تووشی ئازار و ئەشکەنجە هاتووە ، کەچی هەر ماوە و هەر سوارچاکی مەیدانی ژیان و زۆرانە ئەم دوو سێ پەرێگرانەی سەرەوە ، زۆر پێویست بوو بنووسرێن و خوێندەوار بیزانێ . لە سەرێکەوە وەك ڕاستی یەکی پڕ لە شانازی و دڵ خۆشکەر ، لە سەرێکی دیکەشەوە وەك ڕێ خۆشکەرەوە یەك بۆوەرامدانەوەی یەکێکی دیی لە پرسیارەکان .

شیعری کوردی ماوەیەکە لە قاوغە تەسك و تەرووسکەکەی جارانی هاتۆتە دەرەوە و پەڕ و باڵەکانی لێك داوە و قووڵتر بۆتەوە و لە

بارەی زۆر لانی دیکەی ژیان و مەبەست و ئامانجی نەتەوەیی و چینایەتی و مرۆڤایەتی دەدوێ و دەنگی هەڵدەبڕێ ، ڕێباز دەست نیشان دەکا و دەرمان بۆ هەندێ دەردان دیاری دەکا و هەستی بە پەیامە پیرۆزەکەی کردووە کە لەسەر شانیەتی لە خزمەت کردنی چەوساوە و گەل و نیشتمان و مرۆڤایەتیدا .

ئەمە لە باری شیعری کوردییەوە بە گشتی ، بەڵام لە بارەی دوو جۆرەکەی شیعری کوردی (شیعری کۆن و شیعری تازە )وە ، ئەگەر مەبەست لە پرسیارەکەتان ڕوونکردنەوەیان بێ ، ئەوا دەڵێم :ـ

شیعری کۆن ، شیعری کاریگەر و خاوەن تاقی کردنەوە و جێگای دیاری خۆیەتی لە ناو هەست و مێشکی گەلەکەماندا . کە دەڵێم شیعری کۆن ، مەبەستم ئەو شیعرە کلاسییانەیە کەلە سەدەی نۆزدەهەمەوە ، کەڵە شاعیرەکانی کورد بە چڕی و زۆری دەستیان بە دانانیان کرد .

هەندێ لەو شیعرەکلاسییانە ، ئەوانەی هەر لە سەرەتاداووزە و پێزێکی ئەوتۆیان تێدا نەبووە ، یان مردوون و لە ناو چوون ، یان پێیان لەسەر لێواری گۆڕە . شیعری کۆن ، ئەگەر بشڵێم شیعری پیرە (واتە پیر بووە) ، لە هەمان کاتیشدا دەڵێم ، پیری لەش و قەد لەگەڵ پیری ئەم شیعرانەدا جیان . پیری لەش و قەد ، مردنی لە دوایە بەڵام پیرییەکەی ئەمان ، پیرییەکی نەمرە . ووشەکان و شێوازەکانیان پیرن ، بەڵام ناوەرۆك و گیانەکانیان نەمرن . هەندێ شت بە ڕوخسارپیردەبن ، بەڵام بە جۆش و خرۆش و ئاهەنگنا .

کێ بە شۆڕشی کۆیلەکان دەڵێ پیربووە یان مردوە کە لە ناو هەموو شۆڕشێکی ئازادی و پێشکەوتن خوازی ئەمڕۆشدا خۆی

دەنوێنێ(*) ؟! کێ بەو سەربازە نە ناسراوە دەڵێ مردووە و لە ناو چووە کە بۆ جاری یەکەم لە مێژووی مرۆڤایەتیدا دەستی لە ڕووی زۆرداردا ڕاست کردۆتەوە ؟! ئەگەرچی ئێسقانیشی گەلێ جار تێکەڵاوی خۆڵ بووەتەوە •

یان کێ بەم شیعرە جوانە تەڕ و ئاودارە دەڵێ پیر و خێر پێوە نەماو کە شاعیرەکەی دەڵێ •••

**ترازا بەندی سوخمەی ئالی گولناری بە ئاهی من**
**کەچی دەستی لەسەر دانا ، لە سەیری باغ و بەی کردن !!(٢١)**

شیعری کۆن ، خاوەنی ڕەنگ و ڕوو و بەزن و بالاّ و ئادگار و بۆن و تام و چێژی تایبەتی خۆیەتی ، کە بەم شتە تایبەتییانە ، لە چیرۆك ، پەند ، پەخشان و پەخشانە شیعر و ئەوەی کە پێی دەڵێن شیعری نوێ جیا کراوەتەوە و هەر بەمانەش دەوری گرنگ و مێژوویی خۆی دیوە و تا ئێستاش درێژە بە دیتنی پاشماوەی ئەو دەورە دەدا • ئەمە لەگەڵ ئەوەشدا کە دەربڕینی هەستو باری سەرنجی ئەم سەردەمە ، وەك ئەوەی کە پێویستە وە تا ئەو ڕادەیەی کە پێویستە ، بەم شێوە شیعرە و پاراستنی هەموو مەرج و کۆت و پێوەندەکانی کارێکی گرانە بەلاّم ئەگەر شاعیر زانیاری باش و زۆر و سەرنجی قووڵ و ووردی هەبێ و زمان زانی چاك بێ و تاقی کردنەوەی باشی لەگەڵ شیعر نووسیندا هەبێ ، سەر بە کۆسپ و تەگەرەکانی ئەو شێوە شیعرە دا دەنوێنێ • ئەگەر جار و بار سەر کەشییەکی کرد ملی پێ کەچ دەکا و

---

★ ئەم شۆڕشە لە سەدەی یەکەمی پێش زایینیدا : بە سەرۆکایەتی ( سپارتاکۆس ) کە یەکێك بووە لە کۆیلەکان : ڕوویداوە •

بە ئارەزووی خۆی و هەر جۆرێکی بوێ وەهای دا دەڕێژێ •

لەوانەیە لە لای هەندێ کەس سەیر بێ ، ئەگەر بڵێم : شاعیرانی کۆنمان بەتەواوی و دەتوانم بڵێم وەك شاعیرانی ئیمڕۆمان ، هەستیان بە ئەرکی خۆیان کردووە بۆ دەستوورە گرانەکانی شیعری کۆن و حەزیشیان کردوە خۆیانی لێ دەرباز بکەن بەڵام لەبەر ئەوەی خوێندەواری ئەو سەردەمەی کورد ، لەگەڵ کەمی خۆیانەوە قوتابی ( حوجرە = سوختە خانە )و مزگەوتەکان بوون و بە شیعری ئیسلامی ، کە شیعری عەرەبی بووە و بە شیعری دیکەی لە شێوەی ئەو ماوەیەکی دوور و درێژ گۆش کرابوو ، چێژی هەر لەو جۆر و تەرزە شیعرە وەرگرتووە و بڕی بڕیان شکاوە • با ئەمە لێرەدا بمێنێ ، تا لە وەرامدانەوەی پرسیارێکی دیکەدا ، بە درێژی‌تر لێی بدوێم • ئەوانیش چار و نا چار لەسەر بەکار هێنانی ئەو داب و نەریتە بەردەوام بوون • سەرنج بدەن ، بزانن حاجی قادری کۆیی (١٨١٥ - ١٨٩٧)[٢٢] چۆن سکاڵا لە دەست (سەروا = قافیە)دا دەکا :ـ

**جەبینی ماهو ڕووی میهرە ، زولفی دەیجووری**
**سەبەب بە قافیە تەنگی بوو (حاجی) نەینووسی(٢٣)**

لێرەدا نابێ ووتنی ئەوەمان لە بیر بچێ کە لەبەر ئەوەی شیعری بە شێوە کۆن ، مەرج و پێویستی و ئەرکی گرانی هەیە • داڕشتنی پێویستی بە توانایەکی زۆر و پوخت هەیە • هەموو کۆلکە شاعیرێك ، ناتوانێ قەرەی لە قەرەی بدا و لە دەستە و یەخە بوونیدا خۆی بۆ ڕاناگیرێ شیعرەکە دەیدا بە زەویدا •

بە حوکمی عادەت و لێ ڕاهاتن و بە گوێ خۆشی ، تا ماوەیەکی

دور و درێژی دیکەش جەماوەر هەر بە هۆگری ئەم جۆرە هۆنراوەیە دەمێنێتەوە و پارێزگاری لێ دەکا و لە باوەشی خۆی دەگرێ ٠ ٠ بەلاّم هەر چۆنێ بێ ، بە شێوەیەکی گشتی ئەم جۆرە شیعرە ، یان شیعر بەم شێوەیە ، هەتا جیهان و ژیان بەرە و پێشکەوتن بڕوا و زانیاری و تەکنیکی هەمەجۆرە بلاّو ببێتەوە و هەستی خەلّك بەرەو ناسك تری و وورد تری بڕوا ، شەپۆلی شیعری کۆن بەرەو سەرچاوەکەی دەکشێتەوە ، شیعرە زۆر گرنگ و قووڵەکانی ئەم جۆرە شیعرە نەبێ ، ئەوانەی دیی ، پەردەی لەبیر چوونەوەیان بە سەردا دەدرێ ٠

شیعری نوێ ، ئەگەر بتوانین ئەم ناوەی لێ بنێین ، شیاوی ئەم سەردەمە و شیعری دەربڕینی هەست و نەستی نیوەی دووەمی چەرخی بیستەمی ناسراو بە سەردەمی ئازاد بوونی‌گەلان و بلاّوبوونەوەی زانستی و تەکنیك و قووڵ بوونەوە و گەشە کردنی هەموو لایەنێکی ژیانی مرۆڤ و خێرایی و گورج و گۆڵی‌یە ٠

ژیان سەخت بووە ، ئالۆز بووە ، پانی و بەرزایی و قووڵی ، لە سنووری جاران دا نەماوە ٠ خەلّك هوشیار بوونەتەوە دۆست و دوژمن و چاکە و خراپە ناسراون ، لەمەش زیاتر ، هەر یەکێك لەمانە بە چەند جۆر و توێکڵ و هەر یەکەیان لە ڕیزێك بە پێی کات و شوێن دانراون و جێ گۆڕکێیان پێ دەکرێ جا دەربڕینی هەست و مەبەست و بیروباوەڕ و زانیاری ئەم سەردەمە و چۆنیەتی گۆڕانە جۆر بە جۆر و خێراکان و هەڵوێست بەرامبەریان ، بە تایبەتی ئەگەر لەو دەربڕینەدا حیسابێکیش بۆ دوا ڕۆژ و گۆڕانەکانی تێدا بکرێ ٠ ئەم دەربڕین و داڕشتنە وورد و ناسك و قووڵانە بە شاعیری زۆر بە توانا و قووڵ و دەست ڕۆیشتوو نەبێ ٠ بە شیعری لە شێوە کۆنی خاوەن کۆتی

قافیە و زنجیری کێش و گوریسی ووشەی قەبە و مۆسیقەی تایبەتی دا نا پێژرێ • لەبەرئەوە ، شیعری نوێ ، شیعری ئازاد بووە ـ تا ڕادەیەك لەو کۆت و زنجیر و گوریسانە • جۆری زیانەکە وا دەخوازێ کــە شاعیر لە دانانی شــیعر دا ، ئەوەندەی بــە شوێن ڕاستی و تەواوی دەربڕینی مەبەست و هەستی دا بگەڕێ ، ئەوەندە بــە شــوێن ســەرواو پاراستنی کۆتەکانی دیکەی شیعر دا نە گەڕێ •

شیعری تازە ، دەبێ هــەر ئەو شیعرەی خۆمان بێ ، بە هــەموو کەرەستەکانیەوە ، تەنها هەندێ کۆت و زنجیری لە قاچ و دەست و قوفڵی لــە دەم بکرێتەوە ، بۆ ئەوەی بتوانێ بە پێی ئەم سەردەمە قسە بــکا و مەسەلە گرنگەکان و بۆ چوونەکان لە جاران ڕوونتر بکاتەوە و کەڵــکی ئەم قۆناغە و دواڕۆژێکی نزیکی هەبێ •

لە ناوەڕاستی ، ساڵی ١٩٧٠ دا ، لە لایەن کۆمەڵێك لاوەوە ، لــە گەرمەی هاوینی بەغدا دا ، تەپ و تۆزێکی وێژەیی بە ناوی (ڕوانگە) وە بەرپا کرا !!• گۆیا دەیان ویست شیعری کۆن و وێژەی کۆن بە دەم و چــاوی گەلەکەمان دا بدەنەوە و وەهای لە قەڵەم بدەن کە ، هــەتا ئەو ڕۆژەی کــە ئەوانی تێدا هاتەکــایەوە ، هــەر چییەکی گوتراوە یان نووسراوە ، لە سامانی وێژەیی گەلەکەمان دا لــە شەقلی بەقلی بــەو لاوە ، شتێکی دی‌ی نەبووە ، هــەر وەك ئەوەی کە خۆشیان لەو زەمینە ئەدەبی یەدا نە ڕوابن و پێ نە گەیشتبن و لە بڕێ بووبن بە کوڕێ !! بەڵام لە پاش ماوەیەك گەردە لوولەکە نیشتەوە و ئەو بۆێژ و نیمچە بوێژە لاوانە گەڕانەوە سەر ڕچە ڕەسەنەکــەی وێژەی کوردی کــە بە پێی یاسایەکی سروشتی و گشتی‌هاتووە و بریتی‌یە لەم ڕاستی‌یە کــە هەموو شتێکی تازە دەبێ لە شتێــکی لە خۆی کۆنتر بێ و لە ناو منداڵ دانی

ئەو دا دروست بێ و بێتەدەرەوە • من ئەم ڕاستی‌یەم لەم کۆپلە شیعرەدا داڕشتووە •

**هەتا بێ لە دوو دەستم**
**ئەمن تازە پەرستم**
**ئەوەشم هەر لە بیرە**
**ئەمامی تازە ڕواو**
**کۆرپەی دارێکی پیرە !!**

کە دەگوترێ شیعری نوێ ، مانای ئەوەنی‌یە ، هیچ داب و دەستوور و مەرجێکی نی‌یە و لە هەرچی ڕێك وپێکەی (نظام)یە بە دوورە ، نەخێر !! شیعری نوێش یاسا و نەرێت و جۆرە مەرج و خاسیەتی خۆی هەیە • ئەم خاسیەتانە ئەگەر لە دانانی شیعردا لەبەر چاو نەبن و پارێزگاری‌یان لێ نەکرێ ، ئەوە ئەوشتە نووسراوە ، لە شیعر دەر دەچێ و دەبێتە قسەی ئاسایی یان جۆرێکی دوا کەوتوو لە پەخشان•

چۆن مەرج و دەستوورە قورس و گرانەکانی شیعری کۆن لە سەرەتای پەیدابوونیان دا ، زەوق و سەلیقەی خەڵك و ڕۆژگاری ئەو ڕۆژە وەهای دەویست کە دەبوو دەستیان پێوە بگیرێ و لە بەر چاو بن و ئێستاش وا دێ بین بە کۆت و زنجیر و ڕێ لە پێشکەوتنی شیعر بگرن و تا دێ گرنگی‌یان لە شیعر دا کەم دەبێتەوە • هەروەهاش دەستوورەکانی شیعری تازە ( بیروباوەڕی پێشکەوتن‌خوازی و ئامانجی ڕاست‌و گونجاو و سەرنجی ورد و قووڵ کە بە شیعری شێوەی کۆن نەتوانرێ دا بڕێژرێ ، وە بوون و پاراستنی مۆسیقەیەکی خۆش و ناسك لە شیعردا و تا ڕادەیەکیش بوونی جۆرە کێشێکی هاو بەش‌لە نێوان دێڕەکانیدا و نە خستنە پشت گوێی سەرواش ئەگەر لە خۆیەوە بێتە

دەست و مانا و مەبەستی شیرەکە نە گۆڕێ ) .

دەڵێم ئـەم دەستوورانەش ئێستا دەبێ بە چـاکی پـارێزرێن و ڕەفتاریان پێ بکرێ . ئەمە هەر چەندە لە دوا ڕۆژدا ، ئەم دەستوور و مەرجانەش دەبنە ڕێ گرو کۆسپ لەسەر ڕێگەی پێش کەوتنی شیعری ئەو سەردەمە و دەبێ لا ببرێن و دەستوور و مـەرجی دی ، کە ئەو قۆناغە دەست نیشانیان دەکا ، دێنە کایەوە .

شیعری تازە ، لا یەنگرەکـانی بیـانەوێ و نە یانەوێ کوڕی شیعری جارانە . دەبێ هـەندێ شێوە و ئادگاری لەو بچێ و هـەندێ خاسیەت و مەرجی ئەوی تێـدابێ ، دەنا بـە زۆڵ و بیژی لە قـەڵەم دەدرێ و جەماوەری کوردستان بە شیعری خۆیانی نازانن .

لە باس کردنی شیعری تازەدا ، باس نە کردنی (ڕوانگە) ، مەبەستم ئەو کۆمەڵە ئەدیب و نیمچە ئەدیبەیە کـە خۆیان بە خاوەنی ڕێبازێـکی ئەدەبی داهێنەری تازە دەدایە قەڵەم و لە مانـگی حوزەیرانی ســاڵی ١٩٧٠دا بە کۆمەڵ لە ژێر ناوێکی ئاوا دا بەیانێکیان لە بارەی ئەدەبەوە بڵاو کردەوە ، تەنانەت باس کردنێکی زۆر کورتیش بێ ، بە هەل لـە دەست دانی دەزانم بۆ خۆم ... ئەمە جگە لە هۆی گشتیش کە بەهۆی ئەدانیشەوە حەز بە ڕوونکردنەوەی بەرەی ڕوانگە دەکەم . بە تایبـەتی کـە لەوانەیە منیش لـە بارەی ئەو کۆمـەڵەیەوە هەندێ شت بزانم (وەکوو کۆمەڵ باسیان دەکەم نەك وەکوو تاك)کە ڕەنگە تا ئێستا کـەس ڕوونی نەکردبێتــەوە و بێ گومـان خۆشیـان نەیان گوتووە ، منیش تا ئێستا دەرفەتێـکی وەك ئەمــەم بۆ هەڵنەکـەوتووە کــە ئەو خـاڵ و ڕاستی‌یانەی تێــدا بــە خوێنەران ڕا بگەیەنم وە بە تایبەتی کـە ئیتر دواخستنی بۆ ماوەیەکی دیی هەڵناگرێ .

پێشەکی داوای لێ بووردن لە خوێنەری بەڕێز و لەو کەسانە دەکەم کە پرسیارەکەیان ئاراستە کردووم ، ئەگەر لە سنووری پرسیارەکەدا چوونە دەرەوە هەبێ • ئاشکرایە بلاوکراوەکەی ڕوانگەیی‌یەکان کوت و بڕ ، بە دروشمێکی سەرنج ڕاکێشەرەوە (ووشەی نوێ ، بیری نوێ ، کرداری نوێ ) ، ڕەنگە لە مەی دووایی‌یاندا ، مەبەستیان ( بەر هەمی نوێ)بوو بێ ، دەنا خۆ ئەوان پارتێکی سیاسی نەبوون ، هەتا داوای کردار و گورج و گۆلی‌نوێ لە خەلْك بکەن !! بەیانەکە ، بەو شێوەیە و کوت و بڕ کەوتە سەر لاپەڕەی ڕۆژنامەی هاوکاری‌یەوە !! بێ ئەوەی لەوەوبەر ، باسێك ، یا پێویستی‌یەك لە ئارا دا هەبووبێ کە ئەو کۆمەلە یەك بگرن ، بەتایبەتی کە بیروباوەڕ و ئایدیۆلۆجیەتیشیان یەك نەبێ •

دروست بوونی یەکێتی نووسەرانی کورد خۆی ، کە لە ناوەڕاستی مانگی شوباتی ١٩٧٠ داماوەی ئیش کردنی یاسایی پێدرا ، واتە پێش بەیان نامەکەی (١١/ی ئازار) ، کە ئەمە باشترین هەلێك بوو تا ئەو کاتە دەست ئەدیبی کورد کەوتبێ ، بۆ ئەوەی زۆر ترین ژمارەیان لە ناو ئەو یەکێتی‌یەدا یەك بگرن ، ئەمە ماوەی بۆ هیچ پێویستی‌یەکی دیکەی یەك گرتنی ئەدیبان نەهێشتەوە • بە تایبەتی کە یەکێتی‌یەکە تازە پێك هاتبوو وە جارێ یەکەم کۆنگرەشی نەبەستبوو وە بە تێگەیشتنی یاسایی ، داب و دەستوورەکەی کە بۆی دانرابوو ، شێوەی خۆی وەرنە گرتبوو وە تووشی زۆرانبازی بیروباوەڕی و ڕێبازی ئەدەبی نەبوو بوو هەتا خەلْك بۆ ئەوە بچێ و بلێ لە ئەنجامی ئەوانەدا یەکێتی‌یەکە بەکی هەلس و کەوتی کەوتبێ و ئەوکۆمەلە چار و ناچار بیریان لە و کۆبوونەوەیە و یەك گرتنە کردبێتەوە ، بەتایبەتیش کە بەشدارەکانی هەلگری یەك جۆرە بیروباوەڕی چنبایەتی نەبن • بۆیە دەبێ هاتنە کایەوەی ئەو یەك گرتنە ، لەو کات و بارە ئەدەبی‌یەدا ، بەم کوت و

بڕی‌یە و بەبێ ڕێگابۆ خۆش کردنەوە و بێ سەرەتایە ، بۆ مەبەستێك بووبێ کە لە پێویستی‌یەکانی خودی ئەدەبەوە نەبووبێ • بەڵێ ئەمە ڕاست وابوو •

لە پاش پێك هاتنی یەکێتی نووسەرانی کورد و ئیجازە پێ دانی کە بەیاننامەی (١١/ی ئازاری/١٩٧٠)ی بەسەردا هات پەلە کرا نە بڕیاردان بۆ گرتنی یەکەم کۆنگرەی یەکێتی‌یەکە، و ڕۆژی ٧/٥/١٩٧٠ی بۆ دەست نیشان کرا ، (وەك لە بیرم مابێ) •

جا ئەو کۆمەڵە ئەدیبە لاوە ، یەکیان گرت ، تاکوو لە کاتی بەستنی کۆنگرەکەدا ، کەڵکی لێ وەربگرن و دەنگیان هەڵبڕن و هەوڵدانیان کاریگەربێ و لیستەی تایبەتی ئەندامانی دەستەی بەڕێوەبەری گشتی خۆیان هەبێ ، چونکە بە تاکە تاکە خۆیان بە بێ هێز دەزانی بەرامبەر بە ئەدیب و شاعیرە ناودارەکان • من لەم مەبەستەیان گلەیی‌یان لێ ناکەم یەکگرتن بۆ مەبەستێکی وەها ، هیچ جێگەی ڕەخنە لێگرتن و توانج تێ گرتن نی‌یە • بەڵام نە دەبوو ئەوان باری کلۆڵی وێژەیی ئەو کاتەی کورد بقۆزنەوە و یاری بە عەقڵی هەرزەکار و لاوەکان بکەن و کەڵك لە کەمی‌ی ڕۆشنبیری وێژەیی خەڵك وەربگرن ، بۆ زیاتر سەر لێ شێواندن و گوم ڕا کردنیان • هەر وەکوو کردیان و ماوەیەکیش لەسەر کردنی‌بەردەوام بوون •

باری وێژەیی لە کوردستاندا ، هەر لەپاش ساڵی (١٩٦٠)ەوە بەرەو کپی و کەم بەرهەمی‌ی ملی‌نا • ماوەی دەساڵێك درێژەی کێشا ، لەو ماوەیەدا ، ساڵی وابووە ،تاکە هۆنراوەیەك ، یا تاکە چیرۆکێك چی‌یە تێدا بڵاو نەکراوەتەوە ، وە ئەوەی پێی بووترێ ئەدەب ، جار و بارێکی زۆر کەم نەبێ کە لە ئەورووپاوە ، ئەگەر شتێك بڵاوکرابێتەوە

بە دەستی جەماوەر نەگەیشتووە •

ئەو منداڵانەی لە ساڵی ١٩٥٨دا تەمەنیان چوار پێنج ساڵ بووە ، لە ساڵی ١٩٧٠ دا بوو بوون بە لاو • ئەم تامەزرۆ و برسی‌یانەی ئەدەبی کوردی لە هەموو تەمەنی خۆیاندا ، شتی وەها پڕ لە قسەی زل و قەبە و نواندنی جۆش و خرۆش و دەربڕینی دڵسۆزی‌یەکی بێ سنووری بەرامبەر بە ئەدەبی کوردی وەك بەیاننامەکەی ئەمانیان کەم دیبوو یا هەر نەدیبوو ، بۆیە تا ڕادەیەك بەرەو پیری‌یەوەچوون و پشت گیری‌یان لێ کرد • ئەمانیش ئەو بەرەو پیرەوە چوونەیان لە لا خۆش بوو و هەر وەك بڵێی ، مەستی‌ی سەرکەوتن هەڵی گرتبوون درێژەیان بە قسە زلە کانیان داو تا وایان لێ هات کەوتنە بڵاوکردنەوەی شتی وەها کە هەرگیز لەگەڵ زانست دا ناگونجێ •

ئەدەبی کوردی ، لە پێش دروست بوونی ڕوانگە ، چی نووسرابوو، چی گوترابوو ، وە کوو لەمەو بەریش ووتم ـ هەموویان دەدایەوە بە دەم و چاوی کوردا بە شتی بێ کەڵکیان دەژمارد ، بە پێچەوانەی ئەوڕاستی‌یەی کە لە سەرەوە ڕوونم کردەوە کە دەبێ بەرهەمی تازەی وێژەی کوردی و هی هەموو گەلێکی دیکەش ، لە بەرهەمی کۆن بێ‌و لەودا سەر هەڵ بدا •

(ووشەی نوێ) ، (بیری نوێ) ، (کرداری نوێ) ، ئەوەندە شتی بەڕواڵەت خۆشن ، کێ هەیە دڵی بێ‌یان نەکرێتەوە ؟ ، بەتایبەتی جەماوەرێکی وەها بێ‌بەش و تینووی‌ئەدەب • بەڵام ئایا ئەو هەموو (نوێ) یە کوت و پڕ و وەهادەست و برد دەست‌دەکەوێ ؟!! ووشە هەر ووشە کوردی‌یەکانی خۆمانە کە هەمانە و بەسەر لێوی شوان و گاوان و بێری و کاسبکار و کرێکار و خوێندەوارانەوەیە • بیریش هەر ئەو

بیرو باوەڕانەیە کە لە ناو کۆمەڵە هەمە چینەکەماندا هەیە و هـەر یەکەیان ئاوێنـەی ژیانی ئابووری چینێك و چینەدۆستەکانیتی ، شیعر و بەرهەمی ئەدەبیش ئەبێ هـەر لەو بیروباوەڕانەوە هەڵ قوڵێ و بەووشە کوردی‌یەکانی خۆمان دابڕێژرێ • کەواتە ووشەی نوێی چی و بیری نوێی چی ، کە ئەمانە نەبوون بەرهەم و شیعری نوێی چی ؟!

ئێستاش هەندێ لە لاوەکانمان ، لە ئەنجامی ئـەو هاژ و هوژەی ئەوان بە ناوی نوێ خوازی و تازە خوازی‌یەوە بڵاویان کردەوە ، هەروا دەزانن شیعری نوێ ڕوانگەیی‌یەکان دایان هێناوە !!

شیعری نوێ لە ئەدەبی کوردی دا ، بەو شێوەیەی کە ئەمڕۆ دەی ـ بینین ـ ئەم و مژەکـــەی نەبێ کـــە بەم خەستی‌یەی ئەمڕۆ نەبوو ـ چارەکـە سەدەیەك بەر لە یەك گرتنی کۆمەڵەکـەی ڕوانگە و بڵاو کردنەوەی بەیاننامەکەیان ، بوونی خۆی جارێـکی دیـکەش بۆ خەڵك دەر ـ خستووە و داهێنانی ڕوانگەیی‌یەکان نی‌یە • ئەم لایەنە پێویستی بە ڕوونکردنەوەی زیاتـر هـــەیە و پێویستی بە بەڵـگەی مێژوویی و ئاشکرا هـەیە لە وەرامـدانەوەی پرسیارەکـەی لە بارەی شیعری پەخشانەوە کردووتانە ـ پرسیاری نۆیەم ـ لەوێدا باسی دەکەم

بەڵێ ، ڕاستە ڕوانگە بزووتنـەوەیەکی لـە ناو ئەدەبی کوردی دا دروست کرد ، بەڵام تێگەیشتنی هەڵە و نازانستی‌یانەشی لە ناو دا بەجێ هێشت • جا مـن بـە هیـوای ڕاست کردنەوەی ئەو تێگەیشتنەهەڵەو ناڕاستانە ، لە مێشکی لاوەکاندا ، گەڕامەوە سەر ڕوانگەیەك ، کە چۆن کوت و بڕ ، وەك بڵقی سەرئاو پەیدا بوو ، هەر وەهاش کوت و بڕ ، یەکگرتنەکە هەڵوەشایەوە • دوا قسەم لە بارەی شیعری تازەوە ، ئەمەیە:

شیعری نوێ ، بە پێچەوانەی شیعری کۆن ، هەتا ژیان و جیهـان

پێشکەوێ ، بیروباوەڕ و ئەقڵیەتی خەڵك گەشـەدار تر بێ ، برەوی زیاتـر و لـە ژیان کاریگـەر تر دەبێ • شیعری نوێ ، منـاڵ یان هەرزەکاری ئەمڕۆ و لاوی دوا ڕۆژی نزیك و پیاوی دوا ڕۆژی دوورە•

هەتا بێ لە دوو دەستم
ئەمن تازە پەرستم
ئەوەشم هەر لە بیرە
ئەمامی تازە ڕواو
کۆرپەی دارێـکی پیرە

**وەرامی پرسیاری چوارەم**

وەرامدانەوەی ئەم پرسیارە ، پێویستی بەوە هەیە کە شتێك لە بارەی ڕەخنەگرتن خۆیەوە بدوێین :ــ

ڕەخنە گرتن هەڵـەنگاندنی ، کردەوە یەك ، بەر هەمێك ، باسێك یان مەسەلەیەکە بە هەموو لایەنەکانیەوە لەگەڵ حیساب کردندا بۆ کات و شوێن • مافی تەواو دانە لـە لانی ڕوون کردنەوەوە بە لق و چڵی هەر یەکێك لە دوو لایەکەی ئەو ڕەخنە لێگیراوە ، واتە لای چاکی و خراپی ، ڕاستی و نا ڕاستی ، بە کەڵـکی و بێ کەڵکی ، وەکوو خۆی کە هەیە ، بەبێ زیاد و کەم ، نە لێی داتاشرێ و بڕ نرێ و نە بخرێتە سەری و پێوەشی بنووسێنرێ •

ڕووناکی خستنە سەر ئەو لایەنانەیە تێیدا کە خەڵـکی ئاسایی بـە سانایی نایبینن و هەستی پێ ناکەن • ڕێـگا خۆش کردنەوەیە لەبەردەم خۆڕاگرتنی لانە باشەکـە و بەرە پێدان و گەشـە پێ کردن و ووزە و تین فرە کردن و باڵ پێوە نانە بەرەو پێشەوەی بە مەبەستی دەست پێـوە

گرتنی • ئیشك خستنه سەر لانه لاواز و ڕەنج بە فیڕۆ دەرو نا ڕاستەکانیتی • ڕێ نیشان دانه بۆ چۆنیەتی نەمانیان ، به سەردا زاڵ بوونیان ، یان خۆ دوور خستنەوە لێیان • هەموو ئەم شیی کردنەوە و ڕوونکردنەوانه به شێوەیەکی وەها زانستییانه و جوان و گونجاو لە ئەنجامی ڕەخنه لێگرتنەکە هەر بەتەواوی و بە دروستی ، دەق و قەبارە و چۆنیەتی ئەو مەبەستەمان بدا بەدەستەوە کە لەڕەخنەگرتنەکەدا گەرەکمانه و مەبەستمانه •

دوای ڕەخنه لێ گرتن ، ڕەخنه لێگیراو ، جا هەر شتێك بێ ، دەبێ هەموو لانێکی ، ئاشکرای ، شاردراوەی ، پەناوپێچی ، دوور له ڕووناکی چەند و چۆنیەتی بۆ دەربکەوێ و بەتەواوی و بەرجەسته (مجسم) و وێنه گیراو و نیشان دراوبێ ، پەنجەی ڕوونکردنەوە بخرێته سەر ئەو جێگەو خاڵ و پەنایانه کە له شوێنەکانی دیی ڕوونکردنەوەیان زیاتر پێویسته •

جێبەجێ کردنی ئەوەی سەرەوە ، پێویستی سەرشانی هەموو ڕەخنه گرێکه ، که دەبێ لانەکانی ڕەخنه لێگیراوەکه ، وەکوو چۆن هەیه به شێوە و قەبارە و چەندیەتی و چۆنیەتی خۆی دیاریان بخا • جا ئەو ڕەخنه گرە هەلگری هەر چەشنه بیرو باوەڕێکی ئابووری و کۆمەڵایەتی دەبێ با ببێ ، چونکه ئەمه بەلای منەوە ، دەست پاکی ، یان دەست پیسی بەرزییەتی یان نزمی و سووکی خوو ڕەووشتی ڕەخنەگرەکه نیشان دەدا • ئەمه وەك ئەمانەت وایه ، چۆن دەبێ هەموو کەسێك ئەمین بێ و دەست پاك بێ • بۆ ئەم لانەش هەمان پێویستی سەرشان له ئارادایه • هەر کەسێك کە ڕەخنەگربێ و ئەم دەست پاکییەی تێدا نەبێ له دەرخستنی ڕاستی شتەکەدا ، من بەڕەخنه گری ناژمێرم •

لە پاش ئـەو هەنگاوەی سەرەوە ، پاش ئەوەی دەرد و نەخۆشی و سەرچاوەی کزی و لاوازی شوێنەکان یان بەشەکانی ڕەخنە لێگیراوەکە دیاری دەکرێن ، نەخۆشی و هـۆی لاوازی‌یەکـە چـی‌یە ؟ کوێ‌یە ؟ چـەندە ؟ چۆنە ؟ ... هتـد • ئەمجا نۆرەی دەست نیشان کردنی چۆنیەتی چارە سـەر کردنی بنەڕەتی ، ئەگەر نەبوو ، چـارە سـەر کردنی چارەکی‌ی (وەقت)دێ • ئەگـەر ئەمەش هەر نەکرا و لە توانا دا نەبوو ، دەبێ شتێکی وەها بکرێ کە نەخۆشی‌یەکە تەشەنە نەکـاتە لایەکانی دیکەی تەنەکە و ئەو شوێنانەش کە تووش هاتوون ، لێ یان پیس نەکاو و نەخۆشیەکە قاچی قوولتر دا نەگرێ • خۆ ئەگەر ئەمەش هەر لە توانا دا نەبوو ، دەبێ چۆنیەتی خۆ لێ لادانیان ، یان کـەم کردنەوەی زەرەر و زیانیان دیاری بکرێ • ئەمە نەك هەر بۆ ڕەخنـە لێگیراوەکە پێویستە و بەس ، بەڵکوو بۆ خەڵکی تریش ، بۆ دەرس و پەند لێ وەرگرتن و لێ شارەزا بوون پێویستە •

ئەم لایەنە ، یان هەڵسان بەو ئیشەی لـە سەرەوە باسمان کرد بەشێکی گرنـگە لە ڕەخنە گرتن‌دا ، بەڵام بەشی لەمەش گرنـگتر ڕێ نیشان دان و پاڵ پێـوە نانی ڕەخنـە لێگیراوە بۆ بەرەو پێشەوە چوون و ڕووەو باشتر ڕۆیشتن •

ئەم چارە سەر کردنە ، یان کـێشانی نەخشەی چونیەتی خۆ لـێ لادانە ، بـە پێی ڕەخنە گر و بیروباوەڕەکەی دەگۆڕێ • کـە دەڵێم ڕەخنە گر ، مەبەستم ئـەو ڕەخنەگرەیە کە توانییتی بیروباوەڕ و ڕێبازی خۆی لە پاش لێکدانەوەیەکی ڕاست هەڵبژێرێ ، ڕەخنـە گرێـکی پێشکەوتن خواز ، جۆرە ڕێـگایەك بۆ ئەو مەبەستە دیاری دەکا ، کەچی ڕەخنەگرێـکی کۆنەپەرست ، هەر هەمان ڕێگا بەرەواژ(٢٤) دەکاتەوەو

و ئەمیان بە ڕاست دادەنێ •

بە لای منــەوە ، دەبێ ڕەخنەگرتن زانستی‌یانە و مەوزووعی‌یانە و دوور لە هەڵەشەیی و پەلە پەل کردن بێ ، ئەمجا هیوای پێش کەوتن و خزمەت کردنی لێ دەکرێ دەنا ••• تا •

لە بارەی پێویستی بێ لایەنی ڕەخنەگرەوە لە سەیر کردنی ئـەو شتەدا کـە ڕەخنەی لێ دەگرێ ، زۆر گوتراوە و زۆریش نووسراوە ، بەڵام ئاشکرایە ڕەخنە گریش هەر گیزبێ لایەن نابێ • ئەمیش وەکوو هــەموو مرۆڤێـکی دیی ، خـاوەنی بیروباوەڕی چینـایەتی خۆیەتی و هەڵوێستی خـۆی بەرامبـەر بە هــەر شتێك ، ڕەخنە لێگیراوەکەشیان لەگەڵدا بێ ، لەبەر ڕۆشنایی و پاڵ پێوەنانی هەمـان بیروباوەڕ دیاری دەکـا •

ئەمــە کورتەیەك بوو لــە بارەی ڕەخنــە گرتنەوە بە گشتی ، کە دەبێ لە هەموو ڕەخنــە گرتنێـکی میللەتاندا ڕەفتاریان پێ بکرێ و لەبەر چاوبن • لە پێش وەرامدانەوەی پرسـیارەکەتان کە لە بارەی ڕەخنــەی کوردی‌یەوە لێتان کردووم ، بە تایبەتی ( ڕەخنەی سەردەمی لاویم و ڕەخنەی هاو چەرخ ) وەك لــە پرسیارەکەتان دا هاتووە • ئەم قسەیەتان بۆ دەگێڕمــەوە •

وەهـا بزانم پاییزی ساڵی ١٩٧٦ بوو ، لە نزیك نورزدی باکی سلێمانی لەگـەڵ (کاکە مەم فەخری) و (شێرکۆ بێکەس) و کوڕێـــکی دیکەشـیان لەگەڵدابوو ، لەوەوبەر نەمدەناسی بەیەك گەیشتین ، لەگـەڵ ئەودا بــە یەکدی‌یان ناساندین کــە کاك (حەمەی حەمە باقی)بوو • کاکە مـەم ووتی ئەهـا بزانە مــەری سپی و پیریش بووە منیش ووتم

پیری‌یەتی بە سەری سپی نی‌یە • کاك شێرکۆ لەو لاوە خێرا ئەو قسەیەی کردەوە کە لە ناو خەڵك‌دا بڵاوە و ووتی • ڕاستە بەدڵە ، • منیش ووتم نە خێر بە دڵیش نی‌یە • ئەوانیش پرسی‌یان ، ئەی گوایە بەچی‌یە ؟ وەرامم دانەوە ووتم :ـ پیری و لاوی‌ی بە بیروباوەڕە • پیری بیروباوەڕ بە هێز و بە گوڕ و پێشکەوتوو ، لاوە • لاوی بیروباوەڕ کۆن و بێ تین و تەپیوە ، پیرە • لێرە دا هەر سێکیان ، چار و ناچار ڕاکەیان پەسندکردم •

جا کەواتە هەر هیچ نەبێ ، بەو پێوانەیە ، لە پرسیارەکەتان دا ، بوختان‌تان پێ کردووم ، من پیر نیم ، خۆتان پیرن ، باوکتان پیرە !!

ڕەخنە گرتن لە ناو کوردیشدا ، وەك هەموو دیاردەیەکی دیکەی سروشتی‌ی ئەم جیهانە ، بە شێوەیەکی ئاسایی و سروشتی‌یانە هاتووەتەکایەوە • لە ناو خۆماندا شەڕە شیعر و شەڕە پەند و حیکایەت گێڕانەوە و شەڕە شتی دیکە هەبووە • شەوانی درێژی زستانی بەتەمەنی کوردستان ، خەڵك کۆ بوونەتەوە و ئەو شیعرو پەند و حیکایەتانەیان هەڵسەنگاندووە و بە پێی ئەو توانا سەرەتایی‌یە و بۆ چوونەی ئەوساکە ، کە هەیان بووە ، بڕیاریان لە سەر داون •

هەر وەك دەزانین ، لە نێوان شاعیرە کلاسی‌یەکانماندا ، شیعر بە یەکتری و بەکەسانی دیکەش هەڵگوتراوە • بەتایبەتی شەڕە شیعر بۆ شکاندنی یەکتری لە نێوان ئەو شاعیرانە دا کە زۆر بەیان لە سەرەتای سەدەی بیستەم دا ژیاون ، هەبووە • زۆر لە خوێندەواران ، شەڕە شیعرەکانی نێوان (شێخ ڕەزای تاڵەبانی ١٨٣٣ ـ ١٩٠٩ز[٢٥])و (شوکری فەزڵی ١٨٨٢ ـ ١٩٢٦ز[٢٦])یان خوێندۆتەوە •

هەڵبەت ، هەر یەکێك لەو شاعیرانە ، شیعرەکانیان نیشانی زۆر لە

خەڵکی خزم و دۆست و دەورو و پشتی خۆیان داوە و هەر شیعرە لایەنگر و ، نا لا یەنگر و (ئێستایەکی گونەنی : ڕەخنەگر)ی هەبووە •

وەك دەر دەکەوێ ، لە شەڕە شیعرەکەی نێوان ئەو دوو کەڵە شاعیرە دا یەکێك ، یا چەند یەکێك ، هەبوون کە ئاگری لە نێواندا خۆش کردوون • دەنا ئەو دوو شاعیرە ، کە هیچ میرات و زەوی و ئاویان لە نێوان دا نەبووە هەتا ئەو شەڕە گەرمەی لە سەربکەن • ئەو ئاگر لە نێوان دا خۆش کردنەش هەڵبەت پێویستی بە شوی کردنەوە و هەڵسەنگاندن و پێداهەڵدانی شیعری بەرامبەرەکەی بووە ـ بە پێی پلەی ڕۆشنبیری و بۆ چوونی ئەوکاتە ـ بۆ ئەوەی ئەو شاعیرەهان پێدا هەتا وەرامی بەرامبەرەکەی بداتەوە ـ ئەگەر کەسێکی دی لەم ڕووەوە دوابێ و من لە یادم چووبێ ـ بۆیە لێرە دا ناوی نەهێنم ، داوای لێ بوردنی لێ دەکەم ـ دەڵێم لەوانەیە ئەو ئاگر خۆشکەر و ڕەخنە گرە ، لە نێوان ئەو دوو کەڵە شاعیرەدا ، شێخ مەحموود خۆی بووبێ ، بە تایبەتی ڕەخنە گرتن لە شیعری ئەو دوو شاعیرە پلە بەرزە ، لەو کاتەدا، مەگەر هەر لە یەکێکی گەڕیدەی ، خوێندەواری ووریای شاعیری وەك شێخ مەحموودی زیرەك بوەشێتەوە • ئەمە یەکێکە لەو بەڵگە ڕوون و ئاشکرایانەی کە هەمانە لەسەر بوونی ڕەخنەگرتن ، لەو سەردەمەدا
بەڵام بۆچی هیچ ڕەخنە گرتنێکی لەو جۆرەمان بۆ بەجێ نەماوە و بۆ چوونەکانمان لەم بارەیەوە هەمووی هەر لەسەر بنچینەی لێکدانەوە و مەزندەکاری هەڵدەچنین ؟

هۆی ئەمە دەگەڕێتەوە ، بۆ زۆر شت ، بەتایبەتی بۆ سروشتی ڕەخنە گرتن لەو سەردەمەدا • ئەو جۆرە بەرهەمانە نە دەنووسرانەوە و نە لە بەریش دەکران • لە شیعر بەولاوە بەرهەمێکی دیکەی وێژەیی لە

نووسینەوە و دەماو دەم کردن بێ بەش بوون ، بۆیە بە ئێمە نەگەیشتوون.

هەروەها لە یاری کردنەکانیشدا ، ڕەخنە گریان داناوە کە ئەو بڕیاری داوە کام یاری کەرەباشترە ، لە ئەوانی دی و بەو پێیە لـــە ناو خۆماندا جۆرە ڕەخنە گرتنێکی سەرەتایی هەبووە ، دوا جار بەڕەخنەی گەلانی دی موتوربە کراوەو گەشەی کردووە ، بەتایبەتی کاتی شەڕی دووەمی جیهانی و پاش کۆتایی هاتنی‌ی کە دەرگای ڕۆشنبیری سۆشیالیستی و دیموکراتی لیبرالی ئەوروپای بۆ گەلانی ڕۆژ هەڵات ، بە کوردیشەوە کردەوە ، کە بۆ ئەو قۆناغەو ڕادەی تێگەیشتنی ئەو سەردەمەی گەلەکەمان ، تەنانەت دیموکراتی‌یە لیبرالی‌یەکەشی‌ی سوودی هەبوو . هەموو بەشەکانی ڕۆشنبیری کوردی بەم دەروازە بۆ کردنەوەیە کاری تێ کراو گەشەی کردوو جووڵانەوە و گۆڕێکی تازەی تێ کەوت . ڕەخنەی کوردیش هەروەها .

ڕەخنەی وێژەیی کوردی بە قۆناغەکانی پێویستی هاتنەکایەوە و گەشە کردنو پێشکەوتنی خۆیدا تێپەڕبوە و خەریکە پێیدا دەڕوا . ئێستا خەریکی زۆرانە لەگەڵ ژیان و ئەو کۆسپ و تەگەرانەی لە پێشی‌دا فوت بوونەتەوە و هەوڵ دەدا تا ئەو ڕادەیەی بۆی دەلوێ کەڵك لە ڕووناکی و ڕۆشنبیری و گەشە کردن وەربگرێ و بە ڕێگاوەیە و دەڕوا .

ئەو ڕەخنانەی من لەسەر لاپەڕەکانی گۆڤاری گەلاوێژ و ڕۆژنامەی ژین و ئەوانی دیکەدا دیومن کە لە هەندێ هەلی هەڵکەوتوودا دەرچوون ، ڕەخنەی سادە و یەك لانی بوون . یان بۆ پێدا هەڵدان بوون یان بۆ شکاندن . نووسەری بەرهەمەکە ، ئەگەر نزیکی ڕەخنە گرەکە بووبێ ، ئەوا زۆری بە بەرهەمەکەیدا هەڵگوتوە و

ئەگەر لێوەشی دوور بووبێ ئەوا سەر کۆنەی کردوە و سەر و گوێلاکی کوتاوەتەوە • کەم وابووە ڕەخنەی زانستی‌یانەی کاملمان بە بەرچاو کەوتبێ • لەگەڵ ئەمەشدا توند و تیژی‌یە کانیان سنوورێکیان بۆ هەبوو • بە تایبەتی ئەو ڕەخنانەی کە لە گۆڤاری گەلاوێژا دا بلاو دەکرانەوە •

گرنگترین و قووڵترین ڕەخنەی ئەو سەردەمە ، واتە هی‌چلەکان و پەنجاکانی ئەم سەدەیە ، ئەو ڕەخنانەن کە پارتە سیاسی‌یەکانی ئەو کاتە لە هەڵوێست و بیروباوەڕی سیاسی یەکتری‌یان گرتووە • ئەمە لەوەوە هاتووە ، کە ئەو ڕەخنانە ـ هەر چەندە زۆر بەیان یەك لانەبوونە و بۆ شکاندن و جێ بێ لەق کردنی ڕەخنە لێگیراو بووە ـ نووسەرە کانیان کەسانێکی خاوەن پلەی باش بوون لە ڕۆشنبیری سیاسی و ئابووری کۆمەڵایەتی‌دا • ئەم ڕەخنانە کارێکی زۆریان کردۆتە سەر ڕەخنە ویژەیی‌یەکەشەوە و تاڕادەیەکی باش باڵیان پێوە ناوە تا لە قاڵبە تەسك و تروسکەکەی‌دا دەربچێ کە تێدادەژیا ، هەر چەندە لە توند و تیژی‌یەکەشی زیاد کردوە ، کە ئەم توند و تیژی‌یە لەبەرهەمە ڕەخنەیی‌یەکانی ساڵانی ناوەراست و دوایی پەنجاکان دا دیارترن •

کاك (محرەم محمد ئەمین ١٩٢١ـ ٢٣/٧/١٩٨٠ز)ی[*] چیرۆك نووسی پێشکەوتن خواز ، لە بارەی بە هەڵە لە ڕەخنەگەیشتنی هەندێ لە نووسەرەکانی سەردەمی ساڵە کانی چل و پەنجاکانەوە نووسیویەتی

« داخەکەم ئێمە ڕەخنە زۆر بە هەڵە تێگەیوین ، زور کەس هەیە هەر کە ناوی ڕەخنەی لا ئەبەی ڕوو گرژ ئەکا و مۆن ئەبێتەوە •

---

★ ساڵی لە دایك بوونی لەکوڕەکەیەوە بۆم هاتووە و ڕۆژی کۆچ کردنی لە فایلی تەقاویتی‌یەکەی دا وەرم‌گرتووە •

چونکه واتێ گەیشتوون کە ڕەخنە مانای دووەمی جنێوە ... جارێکیان بە بۆنەی بڵاوبوونەوەی (ڕشتەی مرواری) ماموٚستا (علاء الدین)ەوە لە نووسەرێکم پرسی ڕەخنەت هەیە لە (ڕشتەی مرواری) ؟ ووتی :ـ ( استغفر الله ! ) وەکوو پێی بڵێم خوانە خواستە (هیچ جنێوت داوە بە ماموٚستا علاء الدین ) ، ئەمەش هەروی لەبەر ئەوەیە تا ئێستا لە ناو ئێمەدا ڕەخنە بۆ ئەم ئامانجە نا لەبارە بەکار هێنراوە . هەندێ کەسی تریش هەن کە لە ڕەخنە سڵ ئەکەنەوە لەبەر ئەوەیە بە بەرهەمەکانیانا ڕاناپەرموون لە هێڵەکی ڕەخنە بدرێ نەوەکوو لە مرۆر بەو لاوە هیچی تری تیا نەمێنێتەوە و لەبەر چاوی خەڵکی بکەوێ ،(٢٧) .

لە پێش ئەوەی باسی ڕەخنەی ئەو ساڵانە بەجێ بهێڵم ، بە پێویستی دەزانم کە نموونەیەکیش لە شێوە و چۆنیەتی و پلەی ڕەخنەی گیراوی ئەو ماوەیە بخەمە بەر چاو کە ئەو ڕەخنەیە هەر لە خۆشم گیراوە . ڕەخنەیەکی دیکەم هەڵنەبژارد ، نەوەکوو ڕەخنە لێگیراوە کە دڵگیر بێ لە ژیاندنەوە و بەر چاو خستنەوەی ئەوڕەخنەیە کە ماوەی (٣٠،٢٥) ساڵێکی بەسەردا تێپەڕیوە . وە بۆ ئەوەشم هەڵنەبژارد ، وەك کۆنە قین هەتا لێرە دا بەر پەرچی بدەمەوە . ئەوەی ڕاستی بێ ، هەتا چاوم بە نووسینەوەی ئەم وەرامەدا نەخشاندەوە ، نە کەوتەوە بیرم وە تا ئێستاش لەوانەیە بە تەواوی نە چووبمە بنج و بنەوانی ڕەخنەگرە کەوە تەنانەت هەر بۆ ئەوەش کە بزانم کێیە ، چونکە مەبەستم نەبووە و لە سەرێکی دیکەشەوە ڕەوتی ڕۆژگار و پێویستی‌یەکانی گەشە کردن و پێشکەوتنی زمانی کوردی لە بڕیارەکەی (کۆنگرەی یەکەمی ماموٚستایانی کورد لە شەقلاوە ـ ساڵی ١٩٥٩ ) بەر پەرچیان داوەتەوە و ئێستا ڕەخنە کە هیچ ووزەو گیانی تێدا نەماوە . ئەگەر ئەوە نەبێ بە نموونە دەی هێنمەوە ، دەنا پێویست بە بەر پەرچ دانەوە ناکا .

وەکوو زانراوە کە چەند مانگێك لە پێش شۆرشی ١٤/ی تەمموزی/١٩٥٨ دا ، دوو نامیلکەی بچووکی چیرۆکی کورتم بڵاوکردەوە ، یەکێکیان بە ناوی (کەوای نەکرای) ، واتە ( کەوای نەکراو )ەوە بوو کە بریتی بوو لە چیرۆکێکی کورتی کۆمەڵایەتی لە بارەی ژیانی خێزانێکی ڕەنجدەری ماوەیەك لەوەو بەر ، کە بە شێوە زمانی کۆیە نووسرابوو • بێ گومان بۆ ئەوەی کە گرنگی ئەو شێوەیە دەربخەم و خەڵکی کوردستان بە تایبەتی خوێندەواران ، لە ووشە و زاراوەکانی ئەو شێوەیەش شارەزایی یەکیان هەبێ • (کاك شوان) کە هەر وەك لەمەو بەر گوتم ، لە وانەیە ئێستاش بە تەواوی نەزانم کێیە هەر لەسەر ئەمەندە کەچیرۆکە کە بەو شێوە زمانەیە نووسرابوو و هیچی‌تر ، نووکی قەڵەمی لێ تیژ کردبووین ، ئەمە دەقی ڕەخنەکەیەتی، با خۆی پێتان بڵێ چی نووسیبوو :ـ

ئەلف و بێ •••؟

: دەرد و دەرمان و دەستی بێگانە !

: وام زانی لە مِتیە ڕزگار بووین و جارێکی کە منەت باری نابمەوە ، لەبەر ئەوە سەر دەمێك بوو خۆشم تێ نە دەگەیاند ، هەر وەك هەندێ کەسی سپلە کە تا هیوایان بە یەکێك ئەبێ مەرحەبای لێ ناکەن ، وە کە فرمانێکیشیان بەو کەسە بوو بە دەست و بێ‌و کلاشەکەیا دا ئەنووسێن • منیش لە دۆشاو و شیلە شەکر وا نە نیشتبێ • بەڵام زۆری نە خایاند بە پەلە پرووزێ خۆم بە ـ ذ ـ گەیاندەوە بە هۆی ئیملاکەی مامۆستا توفیق وەهبی بەگەوە • مامۆستامان تێینکی‌کەی لەسەم ڕەنگە بۆ خستووینەتە سەر ، یاخود ـ د ـی بۆ کردووین بە ذ ـ• لە مەولا ئەبێ بنووسین :ـ ئەحمەذ ، گۆبەنذ ـ چونکە لە ناو بازێری

سلێمانیدا ، ئەم چەشنە دالانە بە ڕەنگێك ئەبێژن نە داڵە و نە ذال •
جا بۆ بەجێ هێنانی عەدالەت و یەکانی لە ناو هەموو هۆز و تیرە و کووچەکانی کوردستانا پێویستە بکەوینە خۆمان بۆ تیپ دروست کردن•
بۆ وێنە ئەبێ بۆ دزەیی و هەورامی چەند تیپێکی کە پەیدا بکەین چونکە دزەیی ـ ح ـ بە ـ ع ـ ، وە ـ ع ـ بە ـ ح ـ وەهەورامی ـ س ـ بە ـ ث ـ ئەبێژن ، کە گۆڤار و نامەمان بۆ دزەیی نارد ئەبێ عەلی بە حەلی بنووسین ، وە بۆ هەورامیش ـ سلاو بە ـ ثلاو ـ ئەنووسین•ئەوسا زەنگە و باجەلانیش ئەڵێن قووڵ و شووڵمان بە قول و شول بۆ بنووسن • بەم چەشنە شێوەی نووسینی کوردی زمانی کوردی لە زمارە ئەچێتە دەرەوە و تیپەکانیش ئەگەنە زمارەی تیپی چینی کە ئەڵێن ـ ٤٠٠ ـ تیپ ئەبێ ، وە بۆ جیهانی دەرئەخەین کە کورد بۆ نووسین و خوێندنەوە یەك شێوەی نییە بەڵکوو هەزار شێوەی هەیە • وە بە عەرەب و فەرەنگ ئەڵێین ئێوە بە هەڵە چوون کە بە یەك شێوە ئەنووسن و ئەخوێننەوە ، تا زووە واز لەو بیرە کۆنە بێ کەڵکە بهێنن !
شارەکانتان هاندەن هەر یەکە بۆ خۆی و لەسەر شێوەی خۆیان تیپ دروست کەن بۆ نووسین و خوێندنەوە • بەم ڕەنگە زۆری پێ ناچێ نامە و کتێبی هیچ شارێك بۆ هیچ شارێکی کە ناخوێندرێتەوە و لێی تێ ناگەن • ئا بەم چەشنە خوێندەواری بۆ گەلی نەخوێندەوارمان ئاسان و هەرزان ئەکەین زمانەکەمان بۆ نووسین و خوێندن ئەبێ بە یەك زمان !؟

ئەوسا کەسیش ناتوانێ بە ـ ناسرو مارمار ـ ەکەی ووردی و ـ کەوای نەکرای ـ خالد دلێر ناو بلێ ئەمەچییە ؟!

شوان(٢٨)

ئەمە دەقی ڕەخنەکە بوو • کە هەر بە جوانیشی نازانم لە پاش تێپەڕ بوونی بیست و شەش ساڵدا ، هەڵستم بەر پەرچی بدەمەوە •

بۆ ڕەخنەی هاو چەرخ ، ئەو ناوەی تێوە بەکارتان هێناوە هەر وەك ئەوەی کە ڕەخنەکانی یەك دوو نەوە لە پێش ئێمەدا ، ڕەخنەی هاو چەرخ نەبن ـ ئەگەر چەرخ بە سەدە ، بزانین کە ئەم تێکەیشتنە لە وێژەی کوردیدا زۆر بەکار هاتووە ، لە پێش ئەوەی ڕاستە و خۆ بچمە سەر باس کردنیی ، تێرە ، ئەم شوێنە ، ئەم کاتە ، بە هەل دەزانم کە پێشنیازێك زۆر بە کورتی ڕوون بکەمەوە و بخەمە بەر دەستی بوێژەکان ـ ئەگەر کەس لە پێش من ئەمەی نەکرد بێ ـ بۆ ساغ کردنەوە و پەسند کردن ، یان پەسند نە کردنی پێشنیازەکەش ئەمەیە :ـ

وەکوو لە لاوان ڕوونە ، ماوەی ئەو هەشت نۆ ساڵەی کە بە هۆی باری ناهێمنی تایبەتی کوردستانەوە ، لە سەرەتای شەستەکانەوە ، ئەدەبی کوردی ، بە هەموو بەشەکانیەوە تووشی مەیین و بەستن و خەوتن هات ، هەر وەك لەوەوپێشیش هەندێکی لێ دوام • ئەم بارە درێژەی کێشا هەتا دوا دوای شەستەکان ، واتە پێش ساڵی ١٩٧٠ ، کە لەو ساڵانەدا ، وێژەی کوردی دەستی بە جم و جۆڵ و بووژاندنەوە کردەوە و سەرەتای تەووژم و گوڕێکی تازەی ئەدەبی دەرکەوت •

چاك وایە ئێمە ماوەی ئەو هەشت نۆ ساڵە ، بە سنوور دابنێین لە نێوان وێژەی کۆن و وێژەی تازەدا ، بە هەموو بەشەکانیەوە چیرۆك ، ڕەخنە ، پەخشان ، شیعر • ئەگەر تێکەلاوی‌یەکیش هەبێ لە نێوان ئەو دوو ماوە بێزووبی‌یە ، یان ئەو دوو سەردەمە وێژەیی‌یەدا ، ئەوە هەر شتێکی زۆر سروشتی و ئاسایی‌یە • چونکە هیچ دەرکەوتنێکی

گرنگ یەکاو یەك نابێ و پێویستی بە ڕێـگا بۆ خۆش کردنەوە هەیە و نیشانەکانی تاك و تەرا و جار و بار دەردەکەون ، هەتا هەموو لانەکانی و بەشەکانی بە تەواوی یەك دەگرن و گۆڕانێکی چۆنیەتی تێدا دروست دەبێ • ماوەی ئەو هەشت نۆ ساڵە ، بە ماوەیەك دابنێین کە هەر وەهاشە، کـە تێدا ئەدیبانی کورد خوێندویانەتەوە و سەرنجیان‌داوە و زۆرانیان لە مێشك و دەروونی خۆیاندا کردوە و گەشەیان کردوە و ئەوبارە نا سروشتی‌یە ، بە دەیان و بە سەدان ئەشکەنجە و موعاناتی لە مێشکیان دا دروست کردوە و لەبەر ئەوەی ماوەی بەرهـەم بڵاوکردنەوە نەبووە ، پەنگیان خواردووتەوە و کەرەستەی گۆڕانە چـەندی‌یەتیەکـە ، تەواو بەسەر یەکدا کەڵەکە بووە و لەو ساڵانەی دوایی شەستەکان‌دا ، کە باری سیاسی کەمێك هێمن بۆتەوە و ماوەی بڵاوکردنەوەی بەرهەمی ئـەدەبی دەسکەوتووە و گڵی سەرئاوە پەنگ خواردووەکە کەمێك نەرم بۆتەوە و گۆڕانە چۆنیەتی‌یەکە دەرفەتی دەسکەوتووە و تەقینەوەکە بووە •

ئەم پێشنیازە ، هـەر بەتەواوی لەگەڵ بارە ڕامیاری‌یەکەی ئـەو سەردەمەی کوردستانیش‌دا دەگونجێ ، کە دیاردەکەی ( خـــەوتن و گرمۆڵە بوونی ئەدەبی کوردە لەو ماوەیەدا )لە ئەنجامی ئەو ڕامیاری‌یەشە بۆ زیاتر ڕوون کردنەوە دەڵێم :ـ

هەر لەگەڵ بەکار هێنانی ڕەفتاری دوژمنانە بەرامبەر بە گەلی کورد لەلایەن دەسەڵاتداری‌یەتی ئەوکاتەوە ، لـە ناوەڕاست ، یان لـە کۆتایی ساڵی ١٩٦٠ دا ، بارە وێژەیی‌یەکـەش بە ناچـاری تووشی خـۆ گرمۆڵە کردن بووە ، کـە بارە ڕامیاری‌یەکە ،بەرامبەر بەمافەکانی گەلی کورد ، نەختێ شل بۆتەوە و دەستی بە کرانەوە کردووە ، بارە ئەدەبی‌یەکەش وەك کانی‌یەکی پەنـگ خواردوو ، تەقیوە تەوە ، هـەر کـاتێك جۆرە

یموکراسی‌یەك هەبووبێ ، وێژەش لە ژێر سایەی دا گەشاوەتەوە و بەرخۆر داربووە •

بەلای منەوە سەرەتای ماوەی‌خەوتنی ئەدەبەکەمان ، ئەو کاتەیە کە لەسەرەوە باسم کرد • بەڵام ساڵی کۆتایی هاتنی‌ی دەکەوێتە نێوان ساڵەکانی ۹٦۷ ـ ۱۹٦۸ یان ساڵی ۱۹٦۹ ، کە ساغ کردنەوەی پێویستی بە هەندێ گەڕان و لێکۆڵینەوە هەیە هەتابزانین لە کامە ساڵیان دا بڵاوکردنەوەی بەرهەمی کوردی ، لە چەندی‌یەتی و چۆنیەتیدا بە ڕادەیەك بووە کەوامان لێ بکا بڵێین : ماوەی خەوتن و بێ بەرهەمی‌یەکە لەو ساڵەدا کۆتایی هاتووە • بۆ ئەو کەسەی کتێبخانەیەکی ڕێك و پێك شك بیا کە هەموو بەرهەمەکانی ئەو ساڵانەی تێدابێ ، ئەمە ئیشێکی زۆر ئاسانە • لێرەدا پێشنیازەکە ، بۆ خوێندەوار و بوێژەکان بەجێ دێڵم•

بە پێی ئەو پێشنیازەی سەرەوە ، ڕەخنەی ئەم سەر دەمەمان ، لەو ساڵەوە ، یان لەو ماوەیەوە ، دەست پێ دەکا • بێ گومان ڕەخنەی تازەمان گۆڕانێکی باشی بەسەر دا هاتووە کە سەرنج ڕاکێشەرە • ئەو هەنگاوی بەرەو پێشەوە چوونە ، لە لانەکانی قووڵ بوونەوە ، وورد بوونەوە و سەیر کردنی هەموو لایەکان لە ڕەخنە گرتن دا ، بە تایبەتی ڕەخنە گرتن لەبەر تیشك و ڕووناکی تیۆری زانستی و کۆمەڵایەتی کە ڕەخنەکەمان ناویەتی و ئەو پلەیەی پێی گەیشتووە ، لام وایە بەشە وێژەیی‌یەکانی دیکە پێی نەگەیشتبن •

بە ئاوڕ دانەوەیەکی سەر پێیی بۆ ئەدەبی پێش ماوەی کپ بوونەوە ، واتە پێش ساڵی ۱۹٦۰ ، کۆمەڵێك شاعیر و چیرۆك نووسی چاکمان دێتە پێش چاو ، بەڵام بۆ ڕەخنە گر.وانی‌یە ، کە نیشانەی دوا کەوتەیی ڕەخنە کەمانە لەو سەردەمەدا • کەچی ئەمڕۆ ، هەر بە

سەرنج دانێکی ئاسایی و خێرا ، کۆمەڵێك ڕەخنە گری باشمان دێتــە بەر چـاو کە زۆربەی زۆریان لاون ، پێشکەوتن خوازن ٠ ئەمە نیشانەی ئەوەیە کــە ئەم ڕەخنە گرانە لە سەردەمی کپ بوونەوە و خەفە بوونی ئەدەبەکەماندا خۆیان پەروەردە کردوە و پێ گەیشتوون ٠

دوو دڵی لە گوتنی ئەوە دانی بە کە هاتنە کایەوەی ڕەخنە گری باش، مانای وایە کە بەرهەمی ڕەخنەیی باشیان لەبەر دەستی دەر دەچێ ٠ بـۆ بەبیرهێنانەوە دەڵێم کــە ڕەخنــەی جارانمان ، سادە و یــەك لانــە و سەرەتایی و لە پێویست زۆر کورت تر بوو ٠ کە چی ڕەخنــەی ئەمڕۆمان ، بە تایبەتی هی ڕەخنە گرە پێشکەوتن خوازەکان ، لانــی باشی و خرابی ئەو بەرهەمە ، بە بەڵگەی ڕوون و نموونە بۆ هێنانەوە شی دەکەنەوە ، کە ڕەخنەکەی لەبارەیەوە دەنووسن ٠ بە مەبەســتی پێش خســتن و بــەرز کردنەوەی پلــەی بەرهــەمەکە و ڕۆشــنبیری خوێندەواران ، بە قووڵی ، دوور بینانە ، هەموو لاێکی بەر هــەم ، پێوەندی دیالکتیکی لەگەڵ ژیان و تێکۆشان دا ، بە شێوە و زمانێــکی جوان و خۆش دەخەنە ڕوو ٠ ئەم هەنگاوە جوان و بەجـێ یانەیان ، هەڵبەت هەمووی بە پێی توانای ڕۆشنبیری و تێگەیشتن و لێکدانەوەی ئەم پلەیەی خۆیان دەهاوێن ٠

بەڵام ئــەم بارە دڵ خۆشکەرەی کــە ڕەخنەکەمان هەیەتی ، دەبێ باڵمان پێوە بنێ ، بەتایبەتی ڕەخنــە گرەکــانمان ، بۆ زیاتــر کردنی ڕۆشنبیری شۆڕشگێڕانە و ڕەخنە گرانەیان ٠ بە مــانەوە لە ناو قاپێلك و قەبارەی ئەمڕۆیان دا ڕازی نەبن ، با کەڵك لە ڕەخنــە گرە بەرزەکانی گــەلان و کەلەپووری نەتەوایــەتی شۆڕشــگێڕی خۆمــان وەربگرن ، تاوەکوو بتوانن بەرەو پێشەوە هەنــگاو بنێن ٠ ڕاوەستان لەو جێــگایەی

کەیێی گەیشتوون ، بۆ نووسەر بە گشتی وە بۆ ڕەخنە گر بەتایبەتی پەشم و نابەجێیە و مانای تەمەن بە فیڕۆدان و مردن یەتیی •

لە پێش ئەوەی کۆتایی بە وەرامدانەوەی پرسیارەکە بهێنم ، ئەوە دەخەمەوە بیری ڕەخنەگرەکان و خوێنەران ، کە لە ڕەخنەگرتن‌دا هەندێ کەس دڵی هەر دەڕەنجێ ، بە تایبەتی ئەگەر پێداهەڵگوتنی تێدا نەبووبێ بە بەرهەمەکەیدا ، ڕەخنە گر شایەری جاران نی‌یە ، شیعرە فۆلکلۆری و نا فۆلکلۆریەکانیان ئامادە کردبێ و لە هەمووشایی و زەماوندێکدابیڵێتەوە و تەنیا ناوی خاوەن زەماوەندەکە ( لە ڕەخنە گرتن دا ناوی بەرهەمەکە و خاوەنەکەی ) بگۆڕن • لەگەڵ ئەمەشدا ئەگەر گوێ نەدانە دڵ ڕەنجانی خاوەن بەرهەم فرمانی سەرشانی ڕەخنە گربێ ، ئەوا پێڕەوکردنی ڕێبازێکی زانستیانە و هێنانەوەی بەڵگەی ڕاست و بەکار نەهێنانی ڕق وکین و کۆنە غەرەز لە ڕەخنە گرتن دا پێویستی سەر شانی ڕەخنە گرە و زیاتریش •

**وەرامی پرسیاری پێنجەم**

وەکوو زانراوە ، تەم و مژ و قسەی بە توێکڵ ، لە هەر بەرهەمێکی ئەدەبی دابێ ، شاردنەوەی مەبەستێك دەگەیەنێ کە لەبەر هۆیەکی سیاسی یان کۆمەڵایەتی یان لە ترسی زەبرو زەنگ و داپڵۆسین ، یان لەبەر هەر هۆیەکی دیکەبێ ، دەرفەتێکی گونجاو و لە باری بۆ هەڵنە کەوتووە کە بە ئاشکرا و ڕوونی دەربڕدرێ ، لە ناو مەبەستێکی دیکەی ئاشکرادا ، کە ئەمیان ئەصڵەن هەر گەرەك نی‌یە بەڵکوو ئەویان گەرەکە •

تەم و مژ و قسەی بە توێکڵ ـ بەلای منەوە ـ لە سێ حاڵان دا بەکار دەهێندرێ :ـ

١ ـ لە کاتێك دا کە ناکۆکی لە نێوان گـەلو دوژمنە دەسەڵاتدارەکەی دا ، دەگاتە ئەو ڕادەیەی کـە شیر و تیر لەیەك بسوون و دەستە و یەخەی یەکدی بووبن • بە ووتــە زانستییەکە ، واتە دەگـــاتە لووتکەی توند و تیژی و بەنەمانی لایەکیان نەبێ یەکالاّ نا بێتەوە • لەو کاتە دا ئەو بوێژەی خۆی لەڕیزی گەلەکەی دا دەبینێ و لــە ئەنجامی ئەو ناکۆکییە توند و تیژ و خوێنرێژییەی کە ئەمیش لە دەستی دا بە دادە دادە ، جۆش و خرۆش و هەڵقولاّن و پەنـگ خواردنەوە تەنـگی بێ هەڵچنییێ و دەردی ووتەنی ( ڕی زگی !! قــە بووبێ ) و دەستی بە هیج لایەك ڕانەگات و نە زانێ چۆن ئەو لافاوی هەستی دەروونە بە ڕۆڵەکانی گەلەکەی ڕا بگەیەنێ ، وەك بەشدار بوونێك لەوەوە ، بۆ ئەو خەبات و تێکۆشانەی ئەو گـەلە دژی دوژمنەکـەی دەیـکا و ئـەو ئەدیبە بیەوێ بۆ ئەم مەبەستە گەڵێ لە هۆیەکـانی بلاّو کردنەوەی ئـەو دوژمنە وەربـگرێ ، هەڵدەسێ تـەم و مژ بەکـار دەهێنێ • بیروباوەڕ و مـەبەست و ئاراستە کردنەکانی خۆی بە داڕشتنێکی وەها ـ شیعر بێ یان شتی دیی کە توێـکڵ داربێ ، واتە مەبەستێکی ئاشکرای هەبێ (ڕووی دەرەوەی )و دوژمنەکە نە توانێ بەشتێـکی لـە دژی خـۆی لێك بداتەوە و گەلەکە ئەم ماناناشکرایە لەسەر ئەو بوێژە نە زمێرێ وە ئەو بەرهەمە لــە هەمـــان کـات دا ، مـانایەك یان زیاتری شاردراوەی لێ وەربگیرێ کە ودژمنەکە پەی بــە دەرك کردنی ئەو مانایە نەبا ، یان نە توانێ بەسەر خۆی بهێنێ ، بەلاّم گـەلەکە بیان دۆزێتەوە و تێیان بـگاو ، ئەو بەرهەمە ئەو مەبەستە بدا بــە دەستەوە کە بۆیژەکە بەو ناوەوە ناوکی دەبڕێ •

زۆربەی\ بەکـار هێنانی تەم و مژ لەم لانەدا ، یان لەم مەبەستەدا

بە کار دەهێندرێ ، واتە لە لایەن بوێژ و شاعیری خەباتکەر دژی دوژمنێکی دەستەڵاتدار کە ناکۆکی لە نێوانیان دا بە توند و تیژی نەبێ ساغ نەبێتەوە و ماوەی دەربڕینی ئاسایی و بێ تەم و مژ و بێ پێچ و پەنای تێدا نەمابێتەوە •

٢ ـ هەندێ جار شاعیرەکانمان ، بە تایبەتی شاعیرانی قوتابخانەی کۆن لە ناو خۆیاندا یان لەگەڵ خەڵکی دیکەدا ، قسە و شیعری بە تونکڵیان بەکار هێناوە • کە ئەمەش شێوەیەکی سەرەتایی بووە لە بەکار هێنانی ئەوەی ئەمڕۆ پێی دەگوترێ وێژەی تەم مزاوی • شێخ ڕەزای تاڵەبانی (١٨٣٥ ـ ١٩٠٩ـز)(٢٩) لەم تەرزە هۆنراوەیەدا دەستێکی باڵای هەبووە • چونکە لەگەڵ بەهرە و سەلیقە شیعرییە جێو فرۆشییەکەی دا ڕێك کەوتووە و لەویشدا هەڵقوڵاوە • لە دێرە شیعرێك دا ، کە لە خوارەوە دەی بینین لە بەکار هێنانی (زاراوەی) (ئەوکەرە)دا مانایەکی ئاشکرای داوە بە دەستەوە کە (گوێ درێژەکەیە)و بەشاردراوەییش یان بە نیمچە شاردراوەییش مانایەکی دی ، یەکێکی دی مەبەست بووە • کە (شێخ حەسەن) خۆیەتی •

**بۆ کەرێ ئیعلانی حەربی کرد لەگەڵمان شێخ حەسەن**
**سەیری کەن یاران چ گۆبەندێکی گێرا ئەوکەرە(٣٠) •**

یان لە خەتە شیعرێکی دیکەی هەمان شاعیر دا کە باسی دوو ماڵ دەکا ، کەوتبوونە ئەم بەر و ئەو بەری شاری کەرکووکەوە لە دوایدا بە ڕواڵەت گۆیا شاعیر جێگەی خۆی نازانێ و دەڵێ :ـ

**( ماڵی موفتی لەم ) بەرە مەعلوومە قازیش لەو بەرە**
**پیاوی وەك من کێ دەزانێ لەم بەرم یا لەو بەرم ؟ (٣١)**

کەچی مەبەستی شاعیر ، هەر چەندە شاردراوەتەوە ، بەلاّم هـەر ئاشکرایە ، کە شکاندنی خاوەن ماڵەکانە و بە جۆرێکیش کە ئەوان لـــە بەرژەوەندیان دا نەبێ یان نە توانن ئەو شکاندنە بەسەر خۆیاندا بێنن •

لەوانەیە هەندێ کەس بڵێن ، ئەو دێرە شیعرانەی شێخ ڕەزا بۆ جنێو پێـدانە و بەس • من ناڵێم ئەو قسەیە ڕاستی تێدا نی‌یە • بەلاّم لـە هەمان کاتیشدا شاعیر ئـەو دێڕانە و ئـەو تەرزە نووسینەی بە مەبەستی شاردنەوەی جنێو و مەبەستی شکاندن بەکـار هێناوە • کە شیعر و ئەدەبی تەم و مژاوی ئەمڕۆش هـەر بۆ شکاندن و ڕیسوا کردنی ئـەو لانە یا ئەوکەسەیە کە ئەدەبەکە (!) مەبەستی‌یەتی • لە وێژەی ئەمڕۆدا زۆربەی جنێو پێـدان و (هجاء)لە شیعری تەم و مژاوی‌دا خۆی ئەنوێنێ • بـە تایبەتی کـە خوو ڕەووشت و دەم و دووی ئەم سەردەمە لە شاعیر یان لە ئەدیب قبووڵ ناکـەن جنێوی ئاشـــکرا و بێ پێچ و پەنا ، بخـــەنە بەرهەمەکانیانەوە ، لە کاتێك دا کە ئەم هەموو جۆری دەربڕینەی ئەمڕۆ هەبێ ، لـە ڕەخنە گرتنی زانستی‌یانە و هەڵسەنـگاندنی شۆڕشگێڕانە ، لـــە وێژەوانی خاوەن پەیامی پێشکەوتن خـواز قبووڵ ناکرێ جنێو بنووسێ • لـە شاعیرانی ئەمڕۆدا ، بە تایبـەتی لـە چارەکە سەدەی ڕابردوو دا من لە شیعری (هەژاری موکریانی)بەو لاوە ، شیعری بـەم شێوەیەم نەدیوە • دەڵێن ڕۆستەم فەتاح حەوێزیش ، کـە شاعیرێـکی کلاسی‌یە و لە کۆیە دادەنیشێ لەم جۆرە شیعرانەی هەیە • بەلاّم مـــن هیچم لێ نەدیون •

شێخ ڕەزای تاڵەبانی ، دەیتوانی جنێوی گەلێ پیس بەوانە بدا کـە لەو دوو خەتە شیعرە و شیعرەکانی دیکەی لەم چەشنەی دا ناوی هێناون• بەلاّم وا دیارە ، لەبەر ئەوەی ترس ، یان شـەرم و شکۆیەك لـە ئـارا

دا هەبووە ، ئەم جۆرە شیعرەی بۆ نووسیون • کە لەکساتی لێ تۆزینەوەدا ، هەر لە پێشەوە ڕێگەی خۆ لە گلەیی و لۆمە دەرباز کردنی بۆ خۆی دیاری کردووە •

لێرەدا دەگەینە ئەو ڕاستییە کە دەبێ بۆ گوتنی ئەدەبی ئەم و مزاوی دوو شتی ناکۆك هەبن و لە ناو شیعرەکەدا یەك بگرنەوە • ئەو شتانەش :

یەکەمیان : بوونی جۆش و خرۆش و بوونی باری سەرنج و هەست کردنێکی گەورە بە پێویستی دەربڕینیان کە کپ کردنەوەیان و نانە ژێر گڵیان لە توانای ئەدیبەکە دا نەبێ •

دووەمیان : بوونی ترس و زەبر و زەنگ ، یان شەرم و شکۆیەك، یان شتێکی دی لەم ڕەنگە کە بەرهەڵستی ئەم دەربڕینە بە ئاشکرایی و بە بێ پێچ و پەنایە بکا،جا وێژەوانەکە لە هەر یەکێك لەو دوو شتە لە یەك دوورە ، تویکڵێك دا دەتاشێ و لە یەك نزیکیان دەکاتەوە و لە دوایشدا یەك دەگرن و بەرهەمەکە بەو جەشنە لە دایك دەبێ تەنانەت «لامع = شێخ رەزا» خۆشی تا ڕادەیەکی باش دانی بەوەدا ناوە کە ئەگەر لە کەسێك:نەترسابێ و ویستبێتی ئەو کەسە ، بشکێنێ ، شیعری ئاشکرا و ڕوون و بەبێ پێچ و پەنای بۆ داناوە • مانای وایە ، ئەو کەسانەی کە شیعرە بە توێکڵ و دوو مانا بەخشەکانی بۆ داناون ، جۆرە ترسێك یان شەرم و جەشنە ڕێز گرتنێکی بەرامبەریان هەبووە • لە شیعرێك دا کە بۆ (بەڕێوە بەری دارایی = مال مدیری ) ئەو کاتەی نووسیوە دەڵێ :

**ماڵ مودیری کە خەڵکی هەولێرە**
**هەر وەکوو خایە ، بێ خێرە**

**صورەت و سیرەتی لە پیاو ناچێ**
**ئەو قورمساغە ، مێیە یا نێرە ؟**

دوای جنێو دانێکی زوری بە ئاشکرا ، بە ماڵ مودیری • ئەوجـــا ئەوەی دەربڕیوە کە ئێمە لەم ڕۆزگارە دا بۆی چووین ، دەڵێ :ـ

**نییە باکم ئەگەر ئەو خویسە بلێ**
**ئەوە ئەشعاری لامعی کوێرە(*) •**

وەکوو دەبینین ، بەکارهێنانی تـەم و مز و قسەی بە توێکڵ لـــە وێژەکەماندا لە پێش نزیکی سێ چارەکە سەدە لە مەوبەر لەگەڵ هـی ئەمڕۆدا ، لە شێوە و ناوەڕۆك و مەبەستیشدا ، گۆڕانێکی زۆر فرەوان و قووڵی بەسەردا هاتووە • ئەو گۆڕانە فرەوان و قووڵەی بەسەر هـەموو لانەکانی ژیاندا هـاتووە ، بـە تایبەتی لانەکانی بیروباوەڕ و زانستی و وێژە و پێویستی‌یەکانی ژیان و ئاڵۆز بوونی باری ڕامیاری و ••• هتد ، کاریان کردۆتە سـەر تەم و مزەکەش و تەقیوەتەوە و ئەو قاڵبە تەسك و نیمچە ئاشکرایەی شکاندووە و قاڵبێکی فرەوان و شاردراوە تری لـــە خۆی وەرپێچاوە •

جاران دەسەڵاتداری‌یەتی ـ مەبەستم گشتی و فرەوانە ـ ئەمەندەی ئەمڕۆ بە هێز و فرەوان و وورد و خاوەن کەرەستەی دەستەڵاتی و خـۆ سەپاندن و دەزگا و دامەزراوی‌هەمە جۆرە نەبوو • بۆیە قسە و ئەدەب و بڵاوکردنەوە و جۆری نووسینی سەردەمی پێشوو تەم و مزێکی وەك‌ئەوی ئەمڕۆ خەست و توندی گەرەك نە بوو •

---

★ دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانـــی ـ ل ٦١ ـ چاپخـانەی مەریوان ـ بەغدا ـ ١٩٣٥ •

لێرەدا پێویستە شتێکی دیکەش بخەینە بەر چاو • ئەویش ئەوەیە کە هەندێ لە لاوە کانمان ، لە ژێر پەردەی نووسینی ئەدەبی تەماوی دا ، شتی وەها دەنووسن ، کە لەوانەیە خۆشیان نەزانن دەڵێن چی•یان چی‌یان وتووە • ئەم دیاردەیە لە ساڵی ١٩٧٠ بەم لاوە پەرەی سەند و لە شیعردا زیاتر بەدی‌ی دەکرێ •

بەرهەمی لەوبابەتە ، لە ئەدەبی هەر گەلێك دابێ ، بەوێژە نا ژمێردرێ • یەك لە بەردی بناغەی وێـژە ئەوەیە کە دەبێ ڕوون و ئاشکرابێ - بەتایبەتی ئەدەبی شۆڕشگێڕ - مەبەست بدا بە دەستەوە ئەگەر ئەمە لە باری ڕامیاری ئەو وولاتە لە توانا دا نەبێ جێگەی ڕەخنە لێگرتن نی‌یە کە لە ژێر چێنێ تەم و مژ و بە پێچ و پەنا مانای مەبەست دەربڕدرێ ، با ماناکەش هەموو کەس تێی نەگا و هەندێ کەس تێی بگا • ئەمە باشترە لە وەی هەر هیچ کەس‌نەی بینێ و لە ناو مێشك و دەروونی وێژەوانەکە دا گۆڕ بکرێ • دەردی مەسەلەی مەلای مەشوور وتەنی ، ئەوانەی تێی دەگەن ، بۆ ئەوانەی ڕوون دەکەنەوە کە تێی ناگەن • بەڵام ئەگەر هەر هیچ مانایەك دەرنەخا ، ئەوە نە ئەدەبە و نە هیچ ، بە تایبەتی لە کاتێك‌دا کە ماوەی دەربڕینی ئاشکرا هەبێ •

بۆ نمونە دەڵێم ، جار بووە لە توانا دا هەبووە ، دوور لە هەموو تەم و مژێك ، هەموو شت ، یان زۆر شت بگوترێ ، کەچی ئەو کەسانەی من لێرەدا باسیان دەکەم ، لە ژێر ناوی ئەدەبی شۆڕشگێڕ یشدا !! هەر لەسەر ڕێز کردنی ووشە وڕستە کەس تێ نەگەیوەکانی خۆیان ڕۆیشتوون • ئەوە مانای چی لەوە بەدەر کە ئەمانە هەر لە بناغەدا هیچیان پێ نەبووە بیڵێن ؟ وا دەردەکەوێ کە تەم و مژ هەر خۆی وەك مەبەست لەلای ئەو ئەدیبە شۆڕشگێڕانە ئامانجە و مەبەستە و

هیچی‌تر !! بەرد و ترازووی شیعر و ئەدەبیان بەڕادەیەك گۆڕی بوو کە دەیان گوت : شیعر هەتا مەبەست شاردراوە تر و نا دیار تر و تەماوی تر بێ ، ئەوا باشتر و بەکەڵك تر و (ڕەسەن!!)ترە !!

٣ ـ لە بارێکی تریشدا ، بەکار هێنانی تەم و مژ لە ئەدەبدا ڕاست و بە کەڵکە ، ئەویش ئەمەیە کە لەبارێکی زۆر تایبەتی‌دا ، ئەگەر تابلۆیەکی شیعر دروست کرابێ و مانای مەبەست پدا بەدەستەوە بەڵام بۆ جوانترکردن و قووڵتر کردنەوەی مانای تابلۆشیعری‌یەکە ، ئەگەر لە هەندێ شوێنی دا ، تەنکە سێبەرێکی بخرێتە سەر ، وەك تا بلۆیەکی هونەری وێنە کێشان ، ئەوا بەکار هێنانی ئەو تەم و مژە لەو شوێنە دا بەجێ‌یە و وەستا کاری‌یەك دەنوێنێ •

جێی دڵ خۆشی‌یە کە هەندێ لەو لاوانە ، هەستیان بە هەڵەی خۆیان کردووە و گەڕاونەتەوە سەر ڕێبازی ڕەسەنی ئەدەبەکەمان و هەوڵ و تەقەلای خۆیان بۆ ئەم ڕێبازە تەرخان کردووە و ئومێدی بەرهەمی باش و بە کەڵکیان لێ دەکرێ •

**وەرامی پرسیاری شەشەم :**

هەتا ئێستا سێ نامیلکە و دوو کتێبی شیعرم لە چاپ داوە کە بەم جۆرەی خوارەوە بۆتان ڕوون دەکەمەوە •

١ ـ لە ساڵی ١٩٥٧ ، لە کەرکووك ، کە ئەو کاتە لە کۆمپانیای نەوت ئیشم دەکرد ، نامیلکەیەکی هەمەجۆرەم لە چاپخانەی (ترقی!!) لە چاپ‌دا بە ناوی (گزنگی هەتاو)ەوە • ناو ئاخنەکەی بریتی‌بوو لە هەندێ ووتار و پەخشان و یەك دوو پارچە هۆنراوە و چیرۆکێکی کورت •

٢ ـ لە ساڵی ١٩٥٨ ، سێ ، چوار مانگ لە پێش شۆڕشی چواردەی تەمموز ، دوو نامیلکەی بچووکم لە بەغدا ، (خولە و بلە)لە چاپخانەی (الوفاء) و (کەوای نەکرای)لە چاپخانەی (مەعاریف)لە چاپدا •

ناوەرۆکی نامیلکەی یەکەم ، چیرۆکێکی کورتی کۆمەڵایەتی بوو ، کە هەندێ کەم و کوڕی کۆمەڵایەتی دەردەخست ، لە قاڵێکی پێکەنین و گاڵتەجاڕیدا • نامیلکەی (کەوای نەکرای) وانە (کەوای نەکراو) بە شێوە زمانی کۆیە نووسرابوو ، چیرۆکێکی کورتە ، ژیانی خێزانێکی ڕەنجدەر دەردەبڕێ ، کوڕ و دایکێك بوون ، کوڕەکە ساڵی تەنیا بە سێ دینار (ـر٣) دینار ، ڕەنجبەری دەکرد • چەند ساڵێ دایکەکەچاوەڕوانی هەڵیکی کردوە کە شتێك لەو سێ دینارە ، لە قەرز و قۆڵەی ساڵانەیان بمێنێتەوە و کەوایەکی بێ دروست بکا • کەچی (بلکە پیرۆز) ، ئەو هیوایەی لەگەڵ خۆیدا بردە ژێر گڵەوە و کەوا کە هەر نەکرا •••!!

ئەم چیرۆکەم بە چاوی خۆم دیوە • وا دەزانم ئەمڕۆیە ، کوڕ و دایکەکە ، دوا جار لە ماڵی ئێمە ، لە کۆیە دانیشتبوون • ساڵەکەیم لە بیرنەماوە ، بەڵام من مێر منداڵە بووم • دایك و کوڕەکە باسی دابەش کردن و خەرج کردنی سێ دینارەکەیان دەکرد ، پارەی کەوایەکە نەمایەوە و بڕیاریان دا ـ ئینشاڵلا ـ ساڵێکی دی کەوایەکە دروست بکەن !!

٣ ـ لە ساڵی ١٩٦٩ ، لە چاپخانەی (دار السلام)لە بەغدا ، دەستم کرد بە چاپ کردنی یەکەمین کۆمەڵە شیعرم ، بەڵام لەبەرئەوەی لە ڕووداوێکی ئوتۆمۆبیل لەیەك دانێدا ، ڕانم شکا و لەبەر بێکەسی و

گەڕانەوەم بۆ کەرکووك ، بۆ کۆمپانیای نەوت و ..
دەزامەتەکەمی ی ، (ئاگر و گوڵ) لە سەرەتای ۱۹۷۱ دا کەوتە
بازارەوە . لە (ئاگر)ەکەدا ، مەبەست شیعرە نیشتمانی و
شۆڕشگێڕەکان و لە گوڵەکەشدا مەبەست شیعرەکانی دین
پێشەکی یە کەی مامۆستا عبدالرحمن محمد امین زەبیحی
نووسیویەتی ی (۱۰۲) لاپەڕەیە .

٤ ـ لە ساڵی ۱۹۷۹ شدا ، دووەم کۆمەڵە شیعرم لە چاپدا و
بلاوکردەوە بە ناوی (بەرەو لووتکەی ئاوات)ەوە ، لە چاپخانەی
زانکۆی سلێمانی دا چاپ کراوە (۱۱۲) لاپەڕەیە و پێشەکی یەکەشی
خۆم نووسیومە . ئەم بەرهەمەیانم ، بە تێکڕایی ، لە هەموو ئەوانی
دیی خۆشتر گەرەکە .

**وەرامی پرسیاری حەوتەم :**

ئەوەی ڕاستی بێ پڕۆژەی ئەدەبی و نووسینی ترم زۆرن . ئەمانەی
خوارەوە هەندێکیانن :ـ

١ ـ کۆ کردنەوە و چاپ کردنی هەندێ ووتار و چاوپێکەوتنی
ڕۆژنامەیی کە لە ماوەی جیا جیادا نووسراون و هەندێکیان لە
ڕۆژنامە ، یان لە گۆڤارەکاندا بلاوکراونەتەوە . نەوەکا لە دوا
ڕۆژدا هەندێکیان دەست نەکەونەوە و لە ناوبچن .

٢ ـ چیرۆکێکی کورتم لە ساڵی ۱۹٦٥ دانووسیوە بە ناوی ( خەباتێکی
پیرۆز )ەوەو هەتا ئێستا بلاونەکراوەتەوە ، دەمەوێ ، ئەم چیرۆکە،
لەگەڵ دوو چیرۆکە کورتەکەی (کەوای نەکرای)و (خولەوبلە)وە

لەگەڵ ئەو شانۆ گەری یەی لەعەرەبی یەوە وەرم گێڕایە سەر کوردیی بە ناوی (هیرۆشیما)وە ، وە لە ژمارە (١٠)ی گۆڤاری کارواندا بڵاو کرایەوە،ئەم چوار بەرهەمە،لەبەر گێك‌دا پێشکەش بە خوێندەواران بکەمەوە ، وەك بەرهەمی چیرۆك و شانۆیی •

٣ ـ لە دوا دوای ساڵی ١٩٧٣ دابوو ، کەمەسعوود محەمەد ، بەرگی یەکەمی نووسینەکەی کە لەژێر ناوی ( حاجی قادری کۆیی )دا نووسی بووری ، بڵاوکردەوە ، دووسێ لاپەڕەی لە ژێر ناوی (لاباسێك)دا لەو بەرگەدابڵاو کردبۆوە • منیش نامیلکەیەکم لە سەرەتای مانگی (نیسان ١٩٧٤)،وە بە ناوی (ئایدیالیزم لە بەرگی کوردی‌دا) ئامادە کردوە بۆ بەرپەرچ دانەوەی بیروباوەڕەکەی ناوبراو کە لەو لاباسەدا پوختەکەی دەربڕیبوو ، وە نیشانی (رقیب)یشم داوە ، بەڵام بەداخەوە تا ئێستا چاپ نەکراوە • چاپ کردنی ئەو نامیلکەیەش وەك پرۆژەیەك هەرماوە •

٤ ـ یەکێتی نووسەرانی کورد ، یەکەم کەس کە لە بەهاری ساڵی ١٩٥٤ دا ، پێشنیازی دامەزراندنی کردوە ، نووسەری ئەم کتێبەبووە لە مانگی شوباتی ١٩٧٠ ، واتە پاش شانزە ساڵ ، کە دامەزرا و شێوەی یاسایی تەواوی وەرگرت ، دیسان دەستی لەو دامەزراندنەداهەبووە و ئەندامی دەستەی دامەزرێنەر بووە • لەم بارەیەوە ، هەندێ شتم لە مێشك دایە • دەمەوێ وەك نامیلکەیەك پێشکەشی جەماوەری بکەم •

٥ ـ دوا پرۆژەم ، نووسینی کتێبێکە ، لە بارەی ئافرەتی کوردەوە دەدوێ بە جۆرێك کە هەموولاتێکی ژیانیان بگرێتەوە و وەك بەشێك لە

ئافرەتانی هەموو جیهان • ئافرەتی کورد ، وەك مرۆڤ ، وەك دایك ، وەك ئیشکەر وەك (ڕەگەز = ( Sex ) • ئەم لانانە ، بە بەڵگەی ڕاست و سەرئەژمارە (احصاء)ی باوەڕپێکراو دەست نیشان بکا • خێزان ، ژن هێنان و شوو کردن ، لە ناو مرۆڤدا چۆن پێك هاتووە و بە چ قۆناغێك دا تێپەڕیون لە ناو گەلانی ئەم جیهانە فرەوانە دا ، ئایا لە کوردستانیشدا هەر وابووە و بە هەمان قۆناغ و گۆڕاندا تێپەڕیون • ئەم مەبەست و پرسیارانە بە بەڵگەی ڕوون و ئاشکرای کوردەواری خۆمان و ڕەسەن ساغ بکرێتەوە •

مەبەستی هەرە گەورەم لە نووسینی ئەم کتێبەدا ئەوەیە کە ، شتێك ، کەم یا زۆر ، لەم نەزانینەی ئافرەتی کورد ، لە بارەی خۆی و دەور و پشتیی لەم سام و ترس و لەرزەی کە قسەی پڕ و پووچ و بێ بایەخ لە مێشکیدا دروستیان کردوە ، لەم بێ بڕواییەی ئافرەتی کورد بە تواناو دوا ڕۆژی خۆی کەم بکەمەوە و بڕەوێنمەوە و هەندێ لەم بارە گرانە ، کە هەر چەندی بڵێی بارێکی گرانە ، لە سەر شانی ئافرەتی کورد لا بەرم •

جارێ ناوکی کتێبەکە نە بڕاوە و ناویشی نە نراوە • هەر خەریکی خوێندنەوەی سەرچاوەی بڕوایێکراوم و کۆکردنەوەی زانیاری ڕاست و دروستم • بە تایبەتی لە ناو کەلەپووری نەتەوایەتی خۆماندا •

بەم بۆنەیەوە ، داوا لەو خوشك و برایانە دەکەم کە مەبەستیانە ئەو کتێبە چاوی هەڵێنێ و بکەوێتە دەستی خوێندەوارانەوە ، یارمەتیم بدەن ، بە ناردنی هەر شتێك کە لەم فرمانەدا یارمەتیم بدا ، وەك قسەی پێشنیان و پەند و شیعر و حیکایەت و بەڵگە و نیشانە و ئەو سەر ئەژمارانەی لە لای خۆیان ، یان لە دەور و پشتیان دەست دەکەوێ • بە

تایبەتی هی هەرێمـەکانی کرمـانجی ژووروو و هی بەشەکانی دیـکەی کوردستان • ئەمە بۆئەوەی کتێبەکە نەبێتە تایبەتی بە ئافرەتی کرمـانجی خواروو •

تـکام وایە ، هـەر کەسێك ، تەنانەت ئەگـەر یەك پەند ، یـەك دێرە شیعر ، یەك چیرۆکی فۆلکلۆری کوردیشی لـە بارەی ئەم لانانەی لەسەرەوە خستمنە بەر چـاو لەلا دەست بکەوێ ، بۆمی بنێرێ • ئەمـە خزمەتێکی گەلەکەمان و هی ڕاستی دەکا و منیش سوپاسی دەکەم •

**وەرامی پرسیاری هەشتەم :** **ی.ی**

هـەر وەك لـە پرسیارەکەی خۆتاندا دەردەکەوێ و هەر ئەوەش ڕاستە ، لەم سەر دەمەدا ، ئـەو ڕێبـازە ئەدەبی‌یانەی پەیدا بوون • لـە سەردەمێـکی سەرمـایەداری یـەوە هـەڵقوڵاون ئەوانەش ڕێبازی سەرمایەدارین و سەرخانی ئەو ڕژێمەن • بە تایبەتی کـە لە ئەورووپای سەرمایەدارەوە بە وولاتی ئێمـە گەیشتوون (تکا لە خوێنەر دەکەم خودی پرسیارە کـە بخوێنێتەوە) • بێ گومـان ڕای من لەگەڵ ئەوە دانی‌یە کە وێژەوانەکانمان کوێرانە لاسایی ئەو ڕێبازە وێژەیی‌یانە بکەنەوە •

ئەوەی لەبەر هەمەکانی من وورد بوویێتەوە بۆی ڕوون بۆتەوە کە من لەســەر ڕای پێش خستن و گەشـــەدان و قووڵتر کردنەوەی ئەدەبەکەی خـۆمانم ، ئەمجـا موتوربە کردنی بـە ئەدەبی گـەلانی ئازادیخواز و پێشکەوتوو ، ئـەو ئەدەبانەی دانوویان لەگەڵ ئەدەبەکەی ئێمەدا دەکوڵێ • لەسـەر ڕای ئەوەم کـە هـەموو شتێکمان ، هـەموو جموجۆڵێکمان ، بیر کردنەوە بێ ، نووسین ، یان کردەوەی دیکەبێ ، دەبێ لـە خۆمانەوە دەست پێ بکا • هیممەتێك ، تووێك ، گـەرایەك ،

یان باڵ پێوەنانێکی خۆمانی لەگەڵدابێ • ئەمە ئەگەر بە ڕاستی مەبەستمان بێ ، ئەو کارە بە خۆمان ئەنجام بدەین و بەرهەمەکەش بۆ خۆمان بێ • ئەگەر هیچی خۆمانی لەگەڵدا نەبێ ، بە چی ڕوویەك بەهی خۆمانی لەقەڵەم بدەین ؟!

تاقی کردنەوەی خەڵکی دیی ، کە بە هەوڵ و تەمەن لەپێناو دانان و ئارەقەی ناوچەوانی خەڵکی دیی هاتبێتەکایەوە ، ئێمە ڕاستە و خۆ بیهێنینە ناوماڵەکەی خۆمان و بڵێین هی خۆمانە ؟ من هەرگیز لەگەڵ ئەم دزی کردنە دانیم •

ئەگەر لێرەدا وەرامدانەوەکە ببڕینەوە کە دەتوانین ببڕینەوە بەڵام ناتەواو دەبێ و هەر وەك خۆ دزینەوە وایە لە گوتنی پاشماوەی تەواو کەری وەرامەکە ، کە ڕوونکردنەوەی هۆیەکانی ئەم جۆرە دیاردانە و دیاری کردنی چارە سەری گونجاوە بۆیان کە بەمە ئەمجا فەرمانەکە تەواو دەکرێ •

هەر بە سەرنج دانێکی سەر پێیی لە باری وێژەی کوردستانەوە ، لە سەرەتای بیستەکانی ئەم سەدەیەوە تا ئەمڕۆ ، ئەم ڕاستییانەی خوارەوەمان بۆ دەردەکەوێ ، کە ئەگەر بە قووڵی تێیان ڕابمێنین ، دەرد و نەخۆشی و نووچ دان و کۆسپە ئەدەبییەکان و جۆر و چۆنیەتیچارە سەر کردنەکانیانمان بۆ دەردەکەوێ ، بۆمان ڕوون دەبێتەوە ، بارە وێژەییەکەی کوردستان ، دروست بوونی بێ بناغەی وەك (ڕوانگە) بۆچی قبووڵ دەکا و کەم تا زۆر پشتیوانی لێ دەکا ؟ ئاشکرا دەبێ بۆ چی جەبڵە بۆ لاسایی کردنەوەی کوێرانەی ڕێباز و هەنگاوی ئەدەبی وولاتانی تر ، لێدەدا و ئەو جۆرە جمووجۆڵە و هی تریش بە بێ لێکدانەوە دەگرێتە باوەشەوە ؟

١ ـ سەربەستی نووسینی ئەدەبی و بڵاوکردنەوەی ، ماوە و مەودای ئەدیبان بۆ گورج و گۆڵی نواندن ، بە زۆر بار و کاتی جیا جیادا ڕەت بووە • ئەو سەربەستی و ماوە و مەودایە ، تەسك بۆتەوە و فرەوان بۆتەوە بە پێی ئەو بار و کاتانە • جاری وەها بووە ، دوو ، سێ گۆڤار و ڕۆژنامەی کوردی ، یان زیاتریش هەبووە • ماوە هەبووە هەموو جۆرە کتێبێك چاپ بکرێ و بڵاو بکرێتەوە • بەم جۆرە ئەدیب و نووسەران تا ڕادەیەکی باش لە پەنگ خواردنەوە و کپ بوونەوە دوور بوونە و جەماوەریش لە بارێکی پڕ لە تامەزرۆیی و برسیەتی و تێنوویەتی بۆ ئەدەبی ڕاستەقینە دا نەژیاون ، جاری وەهاش هەبووە ، هەر بە جاری جۆڕ بڕ کراوە • ئەوی هەر پێی گوترابێ بەرهەمی ئەدەبی کوردی ، ماوەی بڵاو کردنەوەی نەبووە • وەك ئەو بارەی کە لە ساڵی (١٩٦١)ەوە دەستی پێ کرد و هەشت ، نۆ ساڵێك درێژەی کێشا ، کە لە وەرامی پرسیاری چوارەم و پێنجەمدا باسم کرد • ئەمە وەك کار (فعل)ێك بژمێرین کە کاردانەوەی هەبووە • (رد فعل) ، بەم شێوەیەی خوارەوە •

ئەدیبان لەو کاتانەدا ، مێشکیان ، بەوە کەوا زۆر زانیاری و باری سەرنج و لێکدانەوە و بۆ چوونی جیاجیای ، لە ئەنجامی خوێندنەوەی زۆر و ، وورد سەرنج داندا ، تێدا کۆ بۆتەوە ، مێشکیان بەوانە ئاو ساوە و پەنگی خواردۆتەوە • ئەو بارە ئامادەیی لە ناو زۆربەیان دا خوڵقاندووە ، کە هەر لەگەڵ لا چوون و لا ـ دانی ئەوبارە دا ، بەرە و هەر بیرو باوەڕ و ڕێبازێکی ئەدەبی دا ، دەست درێژ بکەن ، بە تایبەتی ئەوانەی لە بیروباوەڕا ساغ نەبوونەتەوە ، یان قووڵ تێی نەگەیون

«کوڕە چاك نی‌یە لەم بارە ناهەموار و سستی و مەینە ڕزگارمان دەبێ »
ئەمە هەموو بەلگەیەکی زۆر بەیان بووە لەو دەست درێژ کردنەیاندا .

جەماوەریش ، لە پاش ئەو هەموو برسیەتی و تینوویەتی‌یە ، شالآوی بۆ هەموو بەرهەمێکی ئەدەبی بردوە . «هەر شتێك بێت ، کوڕە هەر کوردی بێ و بخوێنرێتەوە ، جا خوا بکەم چی دەبێ با بێ ، خۆ بۆ دوو پیتی کوردی سۆمایی چاومان دا هات !! » ئەمەش وەرامی جەماوەر بووە ، بۆ ئەو کەسانەی ڕەخنەی قبوول کردنی هەموو جۆرە بەرهەمێکیان لێ گرتووە . خۆ ئەگەر ئەو بەرهەمە لە ژێر پەردەی پێشکەوتن خوازی و نوێ کردنەوەی ئەدەب و تازە پەرستی‌ی دابێ ، ئەوە هەر لێ گەڕێ !! کێ ڕایەکی دەکەوێ گلەیی‌یەکی لە بارەیەوە دەربڕێ ؟ !
ئەمەش وەك کاردانەوەی کارەکەی سەرەوە .

بێ گومان ، چ لە ناو ئەدیبەکان و چ لە ناو جەماوەری ئەدەب دۆستدا ، ئەو کەسانەش هەبوون ، کە بە پیر ئەو ناتەواوی و ناکامی‌یەوە نە چوونە و بیریان لەوە کردۆتەوە کە چۆن ئەو بارە نا ڕاست و ناسروشتی‌یانە چارە سەری زانستیانە و تەواوی دروست چارە سەر بکەن و گەلەکەیان لەپاش برسیەتی یەکی زۆر ، لە زۆر خۆری و هەمە جۆر خۆری بپارێزن . بەلآم لە کاتی هەلچوون و داچوون دا ئەوانەی گوێ لە ئەقڵ و ئامۆژگاری زانستیانە و ڕاستی ڕادەگرن ، هەلبەت کەمن .

جا بۆ ئەوەی ئەدەبی کوردی دوچاری ئەو جۆرە کەند و کۆسپ و تەگەرانە نەبێ ، پێویستە هیچ کاتێ ماوەی خۆ دەرخستن و خۆ نواندنی لێ نەگیرێ و بهێلرێ ڕێگاسروشتی‌یەکەی خۆی بگرێتەبەر .

**وەرامی پرسیاری نۆیەم :**

ئەگەر بمەوێ ، وەرامی پرسیارەکەتان بە ڕوونی و بە شێوەیەکی دەست گیر و ئاسان و دوور لە تێکەڵ و پێکەڵی بدەمەوە و وەکوو کە گەرەکە بیخەمە بەر دەستی خوێندەوارانەوە ، پێویستە سنوورێکی دیاری کراو هەبێت لە نێوان سێ خوشکی لەیەك چوودا ، مەبەستم ، پەخشان ، پەخشانە شیعروە لە نێوان شیعری تازەدا • چونکە وەك ئاشکرایە جیاوازی کردن لە نێوانیان دا و نا سینەوەیان بۆ زوربەی خەڵك ، بەشێکی زۆر لە خوێندەوارا نیشیان لەگەڵدایێ ، ئیشێکی گرانە ، چ جای خەڵکی لە خوێندەواری داکلۆڵ • بەتایبەتی کە هەر یەکەیان بەپێی چۆنیەتی و خودی خۆی ، هەڵدەکشێ و دادەکشێ ، بۆ ڕیزی ئەو چەشنەی سەرەوەی ، یان خوارەوەی خۆی •

ئەوەی کە من ئاگاداربم ، ئەم دیوە و ئەشم بیستووە کە هەتا نووسینی ئەم دێڕانە ، لێکۆڵەرەوەیەکی وێژەیی کورد خۆی لە هەورازە دایێ و هەندێکیان لەبارەیەوە دوایێ و دیاری کردبێ کە سنووری هەر یەکەیان لە کوێی ئەوی دیدا دە گەڕێتەوە ؟ دوورنییە ئەم پرسیارە لە وولاتێکی دیی ، یا زیاتریش وەرامی درابێتەوە ، من ئەم بیستووە ئەو وەرامەش بە ئێمە گەیشتبێ ، هەتا یارمەتییەکی ئێمە لەم ڕووەوە بدا •

جا یا وەك پرسیارە دێرینەکەی (ئایا هێلکە لە پێش مریشك ، یان بە پێچەوانەوە مریشك لە پێش هێلکە پەیدا بووە ؟ ) منیش بپرسم و بڵێم : (ئایا شیعر زادەی پەخشانە • یان بەرەوازەکەی ڕاستە ، پەخشان کچی شیعرە ؟ ) •

من ئەم جیا کردنەوەیەم بۆ یەکەم جار دێتە خەیاڵ و ئەمڕۆ نەبێ بیرم لێ نەکردۆتەوە و تەنانەت لێکۆڵینەوەیەکی سەرەتاییشم لێ نەکردوە ، نەك هەر ئەم بەشەی پرسیارەکە ، بەڵکوو ئەم پاکانە کردنە بۆ هەموو پرسیارەکە ، یا بۆ زۆربەی لایەنەکانی پرسیارەکەیە وەرامدانەوەی پرسیارەکەش ئەوە هەڵناگرێ بخرێتە پاش ئەو لێکۆڵینەوەیەوە هەتا ئەگەر زۆر سەرەتایی و سەر پێیش بێ ، بۆیە هەر چۆنێك بێ لە و ڕایانەی لەم بارەیەوە دەریان دەبڕم ، خۆم بە دوور لە هەڵە نازانم • کە وەرامیش دەدەمەوە • بۆ ئەوەنییە ئەرکەکە لەسەر شانملا بدەم ، بەڵکوو بەو مەبەستە خۆم داوێمە ئەو تۆڕەوە • بە هیوای ئەوەی کە وەرامدانەوەکەم ببێ بە هاندەرێك بۆ یەکێکی دیی کە لەم مەیدانەدا سوار چاکی بکا و بەلێکۆڵینەوەیەکی زانستییانە هەڵسێت و بەفریامان بکەوێ ، خەڵکی دیی و منیش لەم تۆڕە ڕزگار بکا • ئەمە کەوا دابنێین ئەگەر هاتو (دووربێ!!) لە ئەنجامی وەرامدانەوەکەی من هەموومان تێی کەوتین !!

وورد بوونەوەیەکی ئاسایی و سەرنج دانێکی سادە بۆ هێنانە بەر چاوی ئەو قۆناغە سەرەتاییەی زیانی مرۆڤ بە خۆیەوەدیوە و زۆر لە زاناکانیش ، بەبێ ئەوەی ڕا و تەگبیر کردنیان لە بەیندا بووبێ ، هەر کەسە لەلای خۆیەوە بە تاقی کردنە وە و لێکۆڵینەوەی خۆی هەڵساوە و بە بەڵگەی زانستی گومان لێ نەکراو ، ساغیان کردۆتەوە

کە مرۆڤ لە سەرەتای ژیانیدا ، ژیانێکی زۆر سادە و سەرەتایی ژیاوە ، لە هەموولانێکی ژیانەوە • زمانێکی نەبووە ، کە لە ووشە و زاراوە و ڕستە و ••• هتدێك هاتبێ و قسەی پێ بکا • لەپاش تێپەڕینی زۆر گۆڕان و پێشکەوتن بە سەری‌دا ، گەیشتوونەتە ئەوەی کە زمان لە ناویاندا بێتە کایەوە و پاش‌ئەوە ، ئەو جا خەت و نووسین بە وێنە و بە جۆرە نووسینی زۆر سەرەتایی ئەو سەردەمە ، چاوی لە جیهانی بووندا هەڵهێناوە • لە پاش پاراو بوونی زمان و ڕوون بوونەوەی ووشە و زاراوە و ڕستەکانی و ڕوودانی گەلێ پێشکەوتنی دیی لە هەموولانێکی ژیانی‌دا ، وێژەش دەستی کردوە بە ڕەگ دروست کردن و پەل و پۆ هاویشتن و بەژن و باڵا دەرخستن و خۆ نواندن •

بە زانینی ئەو ڕاستی‌یەی سەرەوە ، پرسیارە سەرەکی‌یەکە بە جۆرێکی دیی دەکەمەوە و دەڵێم :ـ

ئایا لە توانا دا هەبووە ، هەر لەو هیچەی ، کە ئەدەب و شیعریشی لەگەڵدایێ هیچ بووە و نەبووە ، لەو هیچەی کە هێنامانە بەرچاو ، شیعر هاتبێتە کایەوە !؟ یەکسەر و ڕاستە و خۆ ، لە نەبوونی هیچ جۆرە داڕشتن و پەخشان و پێرەوکە بوون و بە هێز بوونیاندا ، یەکسەر شیعر لە هیچەوە ، زۆر لەوەش سەیر تر کە لە چیرۆکە ئەفسانەیی‌یەکاندا هاتووە ، تاڵە مووی بۆ هەڵکوڕوزێنرابێ ، بە جۆرە کێش و سەروا (قافیە) و مۆسیقەی شیعری‌یەوە ، با ئەو مەرجانە زۆر سادە و سەرەتاییش بووبن ، هەر لە پڕێ بووبێ بە کوڕێ و هاتبێتە کایەوە ؟! بێ‌گومان •••• نا •

کەوایە ئەو باڵاخانەیە دەبێ بناغە و دیوارەکانی ژێرەوەی هەبووبێ و لە کەرەستەی زمان و ئەدەب پێك هاتبێ • هەروەها دەبێ ئەو

کەرەستەیەش لە شیعری ساوای ئەو سەردەمە ، ساوانر و سادە تر بووبێ •

دەبێ بە پێی هەست و زەوق و تێگەیشتن و بۆ چوونی خەڵکی ئەو سەردەمە ، لە سەرەتادا ، لە ووشەی جوانەوە دەستی پێ کردبێ کە جۆرە سۆز و هەستێکی دەربڕیبێ • لەمەوە لەگەڵ گۆڕانی لانەکانی ژیانی ئابووری و بەرهەم هێنان و ئاژەڵداری و کشت و کاڵ کردن و نیشتەجێ بوون و ••• هتد و لەپاش ئەمانەشدا خۆشتر بوونی جۆری ژیانی مرۆڤ ، ئەو ووشانە بەرەبەرە بووبن بە دوان و سێیان و بووبن بەڕستە و ، پتەو تر و چڕتر و داڕژراو تر بووبن و ئەمجا سەروا و کێشیان تێ کەوتبێ و لەپاش کرانەوەی سەر و دڵ و سەلیقەیان ، مۆسیقە و (ئەزمگر = ایقاع) خۆی خزاندبێتە ناویەوە و بووبێ بە بەخشان • ئەمجا دەستێکی دیی بەو پەخشانەدا هێنابێ و هەندێ گۆڕانی تێدا کردبێ و لەچڕیەکەی خەستیی و لە سەرواکەی جوانیی و لەمۆسیقەکەی ڕێك و پێکی و خۆشی لێزیادکردبێ و بە شێوەی شیعر،بە بوونێکی تازەوە دەرکەوتبێ ، کە لەگەڵ پەخشان دا جیاوازی هەبووبێ •

لێرەدا ، بە پێی ڕوونکردنەوەی سەرەوە ، ئەگەر لانەکانی ئەو پرۆژەیەی ئێمە لێی دەدوێین لە کێوێك دا کۆ بکەینەوە و ئەو کێوە بهێنینە بەر چاومان دەڵێم : «شیعر لووتکەی جوانی و پوختی و کاریگەری هەموو جۆرە داڕشتنەکانی هەست و نەست و بیرو و هەڵوێست و مەبەست و ڕاز و نیاز و دەربڕینیانە لە ناو ووتەی مانا لێك دراو و خاوەن کێش و ئەزمگر و مۆسیقە و سەروادا • شیعر لووتکەی کێوەکەیە •

بەو ناساندنەی سەرەوە ، کە شیعرمان پێ ناساند ، دەمێنێتەوە وێنەی پەخشان و پەخشانە شیعریش لە ناو ئەو تێکەڵ و پێکەڵەی وەهایان لێ کردوە هەتا ئێستا ڕوخساری ڕاستەقینەیان دەر نەکەوێ ، دەربهێنین و بیان خەینە چوار چێوەی خۆیانەوە و جێگەی شیاوی خۆیان ، لە تا بلۆخانەی وێژەی کوردی دا هەڵیان واسین •

هەر بۆ ئەم مەبەستە ، وا چاکە کە بگەڕێینەوە سەر ئەو کێوەی هێنامانە بەر چاومان • با جارێکی دیکەش بیهێنینەوە بەر چاومان و دەڵێم :

لەسەرەوە شیعرمان ناساند بە لووتکەی هەرە بەرزی کێوی ئەم بەشەی وێژە • جا بۆ ئەوەی وێنەکە بە جوانی نیشانی خوێنەوار بدەم و وا بکەم بە ئاسانی تێی بگا ، چاك وایە ئەمجا دامێنی کێوە کە باس بکەم کە پەخشانە •

پەخشان ئەو پارچە نووسینە پاك و پوخت و دوور لە هەڵەی زمانەوانی و ڕاست و دروستە ، ناوەرۆك تێر و تەسەل و چڕ و پڕەیە کە مەبەستێك دەدا بە دەستەوە و بە ووشەی جوان و ڕەسەن و پڕاوپڕی مانای مەبەست و ناسك و ڕەوان نووسراوە و نەزمگری هەیە •

لە نووسینی پەخشان دا ، پێویستە حسابێکی باش بۆ شێوە و فۆرم بکرێ بە پلەی یەکەم ئەم لانە ، پەخشان لە نووسینی ئاسایی جیا دەکاتەوە هەتا ڕێك و پێك تر بێ ، لە پەخشانە شیعر نزیك دەبێتەوە و ئەگەر بەرەوا ژیش بێ ، ئەوادەبێتە نووسینێکی ئاسایی و لەویش کەمتر ، با هەر ناویشی پەخشان بێ !! کەمـان خەڵك نەدیوە ناوە جوان و خۆشەکانیان خەسارکردووە !!

نووسینی پەخشان ئاسانترە ، لە نووسینی پەخشانە شیعر • نووسەری پەخشان کەلەپچەو پێوەندی کەمتر لە دەست و قاچ دایە • بۆیە ئەو

باس و باری سەرنج و مەسەلانەی قووڵ و وورد و فرەوانن و مــاوەی پەل هاویشتنیان بۆ ئــەم لاو ئەولا تێدا کەمە ، ئەگــەر بە پەخشان بنووسرێن ، باشتر و خێرا تر دەگەنە مەبەستی خۆیان •

بۆ نموونە ، وا لــە خوارەوە ، پارچــەیەك پەخشانی فۆلــکلۆری دەخەمە بەر چاو ، کە دانانەکەی بەلانی کەمی‌ی لە پەنجا ساڵ کــەمتر نی‌یە و لە یەکێك لە «حەیران»ەکان وەرم گرتووە • دانەری پەخشـانە کــە ، وەك دەردەکەوێ ، لە چوار چێـوە و لە ناو کەرەستەی دروست کردنی کەپرێك دا بۆ خۆشەویستەکەی خولاوەتەوە و بە پێ‌ی توواناى ئەو سەردەمە ، خۆی و یارەکەی وەکوو دووباڵندەی جوان هاتووەتە بەر چاو کە دەبێ هێـلانەی ئەوانیش لــە جوانترین و بۆن خۆشترین گوڵ و گــەڵا دروست بــکرێ ، وەنەشی توانیوە زۆر ئــەم لاو ئەو لا بــکا و دوو باڵ و چوار باڵ بە خەیاڵەکەیەوە بنووسێنێت و مەودا بۆ خــۆی فرەوان و بەرین بــکا و پەخشانەکە بــکا بە پەخشانە شیعر ، یان بـــە شیعر • بۆیە بەم پەخشانە جوانــە ، کــە لەپلەی پەخشــانە شیعردایە ، کەپرەکەی بۆ نازدارەکەی دروست کردووە بەم جۆرەی خوارەوە :ـ

- سێبەری سەفینی بەسەر ماڵە دیانان (٣٢)دا دەڕۆیی •
- دەمکۆتەوە بەژنێ باریك •
- دەوەرە ، ئەو سارەکە هاوینە ، گەلەك گەرمە
- ئەمن کەپرەکی لەبۆ تو دەکەم لە سەری سەفینی‌ی
- بناغەی ئەوێ کەپرێ دادەنێم لە سۆتکەی
- دیواری دەکەم بە قەنەفلێ
- کاریتەی داوێمێ لە داری سۆر گولێ
- هەلاشی دەکەم بە ڕەشە ڕەیحانی‌ی

ـ خۆرەبانی دەکەم بە گلێ
ـ سواغی دەکەم بە خەنەی
ـ ماڵنجی دەکەم بە خاسە ڕەنگێ
ـ دەیڕشێنم بە گوڵاوێ
ـ شەوێ لە سێباری نیوە شەوێ
ـ دەستی بەژنێ نەرمۆکە دەگرم
ـ دەینمە ناو ئەوێ شانە شینێ
ـ شەوبای شەوی لێبدا
ـ بۆنی بڕوا بەسەر ماڵە جیرانان •

لەو کێوەی بە خەیاڵ هێناومانەتە بەر چاوی خۆمانەوە ، جێگەی پەخشانە شیعر ، لە سەرەوەی جێ و ڕێی پەخشانەوە دەست پێ دەکا • لە قەد پاڵە ، پاڵە کانەوە ، تا دەگاتە داڵینی لوتکەوە ، ئەوە هەمووی کۆڕی ئەوە •

پەخشانە شیعر ، جگە لەوەی کە دەبێ هەموو مەرج و کەرەستە و ڕەنگ و بۆنەکانی پەخشانی تێدابێ کە لەسەرەوە باسمان کرد ، دەبێ مۆسیقەی هەبێ و جار و بار سەرواشی تێدابێ • هەتا ڕێك و پێکتر و جوانتربێ ، لە شیعر ، وە هەتا پێچەوانەبێ لە پەخشان نزیکتر دەبێتەوە •

هەموو شتێك لە پلەی ژێرەوە بەرەو بەرزی دەچێ ، بۆیە بە کار ئەمیان لە سەرەوە بەرە و خوارەوەی دەهێنێ •
هێنانی زاراوەی (پەخشانە شیعر)، بە جوانتر دەزانم لە (شیعری پەخشان)

پەخشانە شیعر ، خوشکی ناوەنجی (پەخشان) و (شیعر)ە • ئەگەر زیر و لێ هاتووبێ ، لە زۆر جاران دا جێگەی خوشکی گەورەی پێ پڕ

دەکرێتەوە ، ئەگەرنا ... ئەوەنا . لێرەش‌دا بە کەڵکی و لێوەشاوەیی و لێ هاتوویی مەبەستە ، نەوەك تەمەن‌و و پلە . ئەم بەشــە گرنگەی ئەدەبەکەمان ، وەك کچێکی قۆزی خێزانی ئەدەب ، جێگەی دیاری خۆی هەیە . هــەر چەندە ئێستا دەورێکی ئەوەندە کاری گەری نیە لە ئاستی شیعر و چیرۆك و ڕەخنە و ... هتد . بەڵام پاشە ڕۆژی ڕوونە ، لــە دوا ڕۆژدا چاوەڕوانی هەڵسووڕاندنی دەوری گرنگتری لێ دەکرێ .

شیعری تازەش ، کــە لەســەر پەخشــان و پەخشانە شــیعردا ڕا دەوەستێ ، بوونی سەروا ، بوونی کێش ، بوونی مۆسیقەیەکی خۆشی زرینگەدار تێ‌یدا ، لە ئەوانیشی بەرز تر دەکــاتەوە بۆیە شیعری تازە ، ئەگــەر هــەر یەکێك لە کێش ، مۆسیقە ، سەروا ، لە دانانی‌دا ڕەچــاو نەکرابێ و پشت گوێ خرابێ ، جا بە هەر بیانوویەك دەبێ با ببێ لــە لوونکەی دەهێنێتە خوارەوە و دەیخاتە ســەر باڵەکانی پەخشانە شیعر و پەخشانەوە و لە باران و بەفرباریں و هــەرەس ڕماندا دەکەوێتە ژێر با ماڵی شیعرەوە ، بەلای منــەوە ، دەبێ ئەمــە مەرج و نەریت و سنووری شیعری تازە بێ . جا هەر کەسە تا چ ڕادەیەك ڕەفتاریان پێ دەکــا یا نای‌کا ، ئەمەش وەك هەموو یاسا و نەریت و داب و دەستوورێکی دیی ، ئارەزووی خۆیەتی . نابێ هەرگیز بوونی نەزمگر و مۆسیقە و کێشێکی تایبەتی لە شیعری تازەدا بخرێتە پشت گوێوە ، مــەرج نی‌یە هــەر نیو دێرە ، بڕگەکانی وەك ئەوانی دیی‌بن . وە مەرجیش نی‌یە بۆ ســەروا مانا و ناوەرۆك سەر ببڕدرێ ، بەڵام ناش بێ بــە جارێ بخرێتە پشت گوێوە . دەبێ لە هەڵسەنگاندن و ڕەخنە گرتن دا ئەم ڕاستی‌یانە لەبەر چــاوبن .

ئەو داڕشتنە ویژەیی‌یە ، پلە بەرزەی گەیشتووەتە لووتکە و تا ئێستا پێمان گوتووە ، شیعری تازە ، کە ئەمە ناو لێنانێکی‌هەڵەیە ، یان ناومان ناوە بە شیعری سەربەست ، یان شیعری شێوە نوێ ، کە ئەم دوو ناوەی دوایی‌یان لە ڕاستی نزیکترن ، زۆر لە دەمێکەوە هەیە • هەموو گۆرانیە ڕەسەنەکان و حەیران و لاوك و زۆربەی ئەو بەند و داستان و ئەفسانە دێرینانەی بۆمان ماونەتەوە ، بەم داڕشتنە لووتکەیە نووسراون و سەر جەمی مەرجەکانی ئەو شیعرانەیان تێدایە کە ئەمڕۆ پێ‌یان دەنووسرێن • وەکووساغیان لەلانی زمانەوانی‌ی ، جوانی و خۆشی و ڕەسەنی سەلیقەی دارشتنەکانیان ، بوونی نەزمگر و کێش و مۆسیقە و سەروا ••• هتد ، لەناویاندا •

لە خوارەوە بۆ نموونە ، چەند پارچەیەکیان لێ دەخەمە بەرچاو ، کە هەر نەبێ تەمەنی هیچ کامێکیان لە شەصت ، حەفتا ساڵ کەمترنی‌یە ، ئەگەر زۆر زیاتر نەبێ ، بە تایبەتی ئەو یەك دوو کۆپلەیەی لە گۆرانیەکانی سێوەی هونەرمەند وەرم گرتوون کە بەلانی کەمی‌ی دوو سێ پشت لە پێش سێوەوە هەبوون و تەمەنیان لە سەدەیەکی تەواو کەمترنی‌یە • من لێرە دا هەر بەمەندە واز دێنم کە وەبیر خەڵکیان دەهێنمەوە ونیشانی خوێندەوارانیان دەدەمەوە ، لەبەر کەم دەرفەتی ، خۆم لەو لێ گەڕان و لێکۆڵینەوەیە بە شوێن مێژووی دانانیاندا دە دزمەوە •

لە یەکێك لە گۆرانیەکانی سێوە دا کە لە ساڵی ١٩٥٢ لە ئێستگەی بەغدا ــ بەشی کوردی تۆماری کردوە ، ئەم دوو کۆپلەیە دەخەمە بەرچاو •

- ١ -

ـ ئەرێ گوڵێ ، گوڵە جوانێ
ـ سنگ سپی‌نی ، مەمك فنجانێ
ـ داك حدودێ ، باب شاسەیوانێ
ـ ئەرێ خواکەی گوڵێ ، ئەگەر جەللادان لەمن دەگرن چـــوار گوشەی مەیدانێ
ـ چەرخەچی(٣٣) شا میسری‌یان(٣٤) دەر دێنن لە کالانێ
ـ تو عەشقی خودای بەوێ ڕۆژی جومعەیە ، شەمووی بەسەردا دێ •
ـ ئەوان گرتیان بەردەوە لە بەندیخانێ •

- ٢ -

ـ ئەرێ گوڵێ ، ئامان گوڵەسمەرێ(٣٥)
ـ کەزی زەرد ، چاو سەقەرێ
ـ خواکەی سەرت بێنە دەرێ
ـ لە تاقان ، لە پەنجەران
ـ لە چوار کناران ، (بەکە ••• بیم) جگەرێ(٣٦)
ـ ئەی برادەرینە
ـ وە من چەندی حەکیم و لوقمانم هاتیە سەرێ
ـ ئەگەر حەکیم و لوقمان دەرێن
ـ برینداری گورێیە و پێی نابەین زەفەرێ

له بەیتی شێخ فەرخیدا ، ئەو کاتەی فەرخۆکە ، بە فێڵ و تەڵە کە بازیی ، خۆی دەبن کەڵەکە بەردی داویٚ ، تا کوڵو کانی لە کچۆڵان و لە خاتوو ئەستیٚ بکا بە قوڕپێوان و هەموو لەش و قاچ و قولۆکەی خۆی ، شین و مۆر دەکاتەوە و خۆی دەمریٚنیٚ !! خاتوو ، دەنگی بە « ووسوی موغانیی » ئەبیٚ بە کەسیی دیی ڕا ناگا • هەر چەندە ڕقی هەموو دونیاشی لیٚیە ، بەلاٚنەکینیٚ ، بەناحیلاجی ئەم چەند بەندەی داوێتیٚ !!

ـ ئەریٚ هۆ کەوڵ سووری لەسەربانیی
ـ بە تۆ دەڵێن «ووسووی موغانیی»(٢٧)
ـ ئەتۆ خۆشەویستی دە ماڵی میرانیی
ـ تو خوا بە دەستەکی دەست و برد
ـ هەر بەیٚیەکی ڕەوانیی
ـ خەبەرەکیم لە بۆ بدەوە ماڵی میرانیی
ـ ڕەبی خاتوو کویٚر بیٚ لە چاوان
ـ لاڵ بیٚ لە زوبانی
ـ ئەوە فەرخی ئامۆزام
ـ لێرە کەوتووە ، بەبیٚ زوبانیی

ئەگەر ئەم زاو و زێیەی لەسەرەوە باسمان کرد ڕاست بیٚ کە پەخشان لە جۆرە داڕشتنێکی سەرەتایی و پەخشانە شیعر لە پەخشان و شیعری شێوە تازە

## وەرامی پرسیاری دەیەم :

بەشێکی وەرامی ئەم پرسیارە ، لە وەرامی پرسیارەکانی ژمـــارە (٦) و (٧) دا وەرام دراوەتەوە • تـکام وایە خوێنەری بەرێز ئەگـــەر مەبەستی بوو ، پێیدا بچێتەوە • بۆ بە شەکەی دیشوی دەڵێم :

من لەمنداڵی‌یەوە حـەز بە سروود و گۆرانی دەکەم و گۆرانی و ســرووديش دەڵێـم و دەیان نووسم و دایان دەنێـم • تا ئێستـا ئاوازی (٢٨ یان ٣٠) سروود و گۆرانیم داناوە لەگەڵ شیعرەکانیشیاندا ، شیعری دوو گۆرانیان نەبێ کـە هی خۆم نین • یەکێکیان هی «گۆران»، بە ناوی «بۆ جوانی سەرەڕێ» دووەمیشیان شیعری «نالی» یە ( **کـە تۆی قیبلـە دممت سا بێنه ، قوربان ـ لەسەر قوبلە دلم مەشکێنە ، قوربان** )• خۆم بە قەرزاری حاجی قادری کۆیی دەزانم کە تا ئێستا شیعرێکی ئەویشم نـە کردووەتە گۆرانیی •

لە ناوەڕاستی مانـگی مارتی ١٩٥٧ ، بۆ یەکەم جار گۆرانیم لـە ئیستگەی بێ تەلی بەغدا بەشی کوردی‌دا تۆمار کرد • هەتا ساڵی ١٩٥٩ جار و بار ، بەتایبـەتی لە ناوەڕاستی مانـگی مـارتی ئەو ساڵانەدا ، بۆ تۆمار کردنی سروود و گۆرانی ، دەچوومـە ئیستـگەی ناو براو • ئێستا هەندێ لەو سروود و گۆرانیانەی هەمن،بە دەنگی خۆم لەو ئیستگەیە هەیە و بڕێکیان لە ئاهەنگە گشتی‌یە نیشتمانی و نەتەوەیی‌یەکاندا خۆم پێشکەشم کردوونە و تۆمـار کراون و هەندێکیـان بە دەنگی هونەرمەندەکانی دیی تۆمار کراون و بلاون • بەشێکیش لەو سروود و گۆرانیانە تا ئێستا بلاو نەکراونەتەوە ، چـۆن لە کـاتی خۆیاندا ئامـادە کراون ـ شیعر و ئاوازەکانیان ـ هەروەها ماونەتەوە و تۆمار نەکراون و تەنانەت لـە هیچ ئاهەنگێکیش‌دا پێشکەش بە جەماوەر نەکراون •

گلەییم لە بارەی چۆنیەتی تۆمارکردنی سروود و گۆرانیەکانی ئیستگەی بەشی کوردی‌یەوە زۆر هەیە . هەتا بلێی خراپ تۆمار کراون . پیاو پێی شەرمە خۆیان لێ بە خاوەن بکا .

ئەگەر بۆم بگونجێ ، ئەو سروود و گۆرانیانە ، هەموویان ، لە شێوەی کتێبێکی گۆرانی‌دا بلاو دەکەمەوە . کە هەر گۆرانیە ، یان هەر سروودە ، دەقی هۆنراوەکەی ودەقی ئاوازەکەی کە بە نۆتە نووسرابێتەوە ، لەگەڵدابێ .

له بەیانی ڕۆژی (١٢ـ١٠ـ٩٨٢) کاك لەتیف هەڵمەتی شـاعیر ، ناردراوی دەزگای (ڕۆشنبیری و بڵاو کردنەوەی کوردی) هـــەندێ پرسیاری بۆ هێنام بۆ وەرام دانەوەیان . پشت ئەستوور بەو بەڵێنانەی بە خۆیان دابوو ، بەڵێنی دامی کە وەرامەکانم وەکوو خۆیان بڵاو بکرێنەوە.

لەم چەند لاپەڕەیەی داهـاتوودا ، دەقی پرسیار و وەرامەکانیـان دەخەمە بەرچاو .

پ١ ـ ئەم ـ ١٢ ـ ساڵەی چاپەمەنی کوردی دەزگاکەمان بە گشتی چۆن هەڵدەسەنگێنن ؟

پ٢ : دەوری بەیان لە بواری خزمەتکردنی ئەدەبی کوردی دا چـۆن ئەبینن ؟

پ٣ : ئایا گۆڤاری بەیان توانیویەتی لـەم ـ ١٢ ـ ساڵەی تەمـەنیدا بەشداری لە مەسەلە هەڵایساوەکانی نێو کۆڕی ڕۆشنبیری ئەدەبی کوردی بکات ... چۆن ؟

پ٤ : لە بواری خزمەتکردنی ئەدەبی و کەلەپووری کوردی دا ئایا ئەم گۆڤارە توانیویەتی شتێ بە شتێ بکات ... چۆن ؟

پ٥ : بەیانت چۆن ئەوێ لە دەرهێنانی هونەری و ناوەرۆك و بەرگ دا ؟

پ٦ : بەشداری کردنی بەیان لە بزووتنەوەی ڕەخنەی ئەدەبی کوردی دا چۆن دەستنیشان ئەکەیت ؟

**وەرامی پرسیاری یەکەم**

١ ـ ئەوەی ڕاستی بێ ، دەزگاکەتان کە ناوی (دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاو کردنەوەی کوردی)یە ، تا ئێستا ، لە هەموو زیانی نەتەوەی کورد دا ، بە ڕواڵەت و بە دیمەن ، گەورە ترین دەزگایەکی بڵاوکردنەوە و نووسینە ، کە خەریکی وێژە و زمانی کوردی بووبێ . بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ، دەزگاکەتان هێشتا هەموو پێویستییەکانی ئەدەبی کوردی پڕ ناکاتەوە . لە کاتێك دا کە بڵاوکردنەوە و نووسینی عەرەبی بە دەیان دەزگای ، لە دەزگاکەی ئێوە گەورەتر و فرەوانتر و دەستەڵات دارتر و بە توانا تری هەیە ، بڵاوکردنەوە و نووسینی کوردی هەر دەزگاکەی ئێوەیە کە بۆ ئەم مەبەستە بە ئاشکرا تەرخان کرابێ و ئەمیش بە نیوە چڵی‌ی .

ڕاستی ئەم قسەیەمان لە یارمەتی نەدان و چاپ نە کردنی زۆر لە کتێبی وێژەوانەکان و نووسەرانی دیدا بۆ دەر دەکەوێ ، کە ئەمە وا دەکا ، ئەو وێژەوان و نووسەرانە ، بە قەرد و فەرد بە چاپ کردنی کتێبەکانیان هەڵبستن . چاپ کردنی کتێبیش بەم هەرزانی یە !!

٢ ـ دەزگاکەتان بە گشتی ، ڕووە بڵاو کردنەوەکەی ئاشکرا و ڕووتر پێوە دیارە هەتا ڕووە ڕۆشنبیرییەکەی ، واتە بڵاوکەرەوەیە زیاتر لەوەی کە خەریکی ڕۆشنبیری کوردی بێ . بۆیە بەلای منەوە دەسکاری کردنێکی بچووکی ناوەکەی پێویستە .

٣ ـ .

**وەرامی پرسیاری دووەم**

لە دوانزە ساڵی ڕابردوودا ، لە خزمەت کردنی وێژەی کوردی دا ، بەیان دەوری هەبووە • ئەو دەورە بەلای منەوە لە خزمەت کردنی زمـانی کوردیدا ، وەك زمان باشتر دیارە لە ناو بڵاوکراوە جۆر بـە جۆرەکـانی دا زۆر ووشـە و زاراوە و ئیـدیۆمی کۆن و شاردراوەی زیاندۆتەوە و هێنـاوەتەوە ڕوو ئەمـە هـەتا ئەمڕۆ • بەڵام لەوانەیە هیچ حیسابێکی نە کردبێ بۆ ئەو مەترسیەی ئەمڕۆ و بەیانی لەسەر زمـانی کوردی هەیە • مەترسیەکەش لە بە عـەرەبی ناو لێنانی ئـەو دەزگـا ئابووری و تەندروستی و کۆمەڵایەتی و خزمـەت گوزاری یانـەدا دەردەکەوێ کە لە کوردستان دا دامەزراون و دادەمەزرێن • وەك : (من ناوەکانیان وەکوو ووتنی خەڵك دەنووسم) (قرای عصری) ، ( منشەی فلان شت ـ ناوەکەشی هەر بە عەرەبی) ، (عیادەی ـ فلان شت ـ بـە عەرەبی) یان (صیدلیەی ئیستیشاری اولی)و بە دەیان ناوی دیی • ئەمـە وەها بڕوا وای لێ دێ زۆربەی ئەو دەزگایانەی پێوەندییان ڕاستە و خۆ بە ژیانی خەڵکەوە هەیە ، ناوی کوردییان نابێ • شەپۆلێك لـە ناوی عەرەبی دەڕژێتە ناو زمانە کەمانەوە • بە پێویستی دەزانم لەگەڵ کۆڕی زانیاری دا بیرێك لەمە بکەنەوە و چارەیەکی بۆ دابنێن •

**وەرامی پرسیاری سێیەم**

گۆڤاری (بەیان) ، لە بەرئەوەی ڕاستە و خۆ ، ڕێ نیشان دەر و ئاراستە کـەری وێژەوان و ڕۆشنبیرانی کوردستان نییە ، دەوری هـەر بڵاوکردنەوەی ئەو بەر هەمـانە بووە کە بە پێی بۆ چوون و لێ زانینی لیپرسراو ، یان لیپرسراوانی سەردەم ، هەر سەردەمێك بێ ، باش و بە کەڵك بوون ، نەیتوانیوە دەورێـکی کاریـگەر و بریار لەسەر دراو و

پەسندکراو بۆ هیچ مەسەلەیەکی ڕۆشنبیری و ئەدەبی کوردی بنوێنێ •

بەڵێ بەشداری کردوە لە هەڵایسانی ئـەو مەسەلانەدا • ئـەو بەشدارییانەش لەوە دا خۆیان نواندوە کە مەسەلەکانی خستۆتە ناو کۆڕی گوفت و گۆ لەسـەر کـردن و نووسین و بڵاوکردنەوە ، بـەڵام نەیتوانیوە ساغیان بـکاتەوە و دوا بڕیاریان لەسەر بدا • جـگە لەمـە ، هەندێ مەسەلەی ویژەیی زۆر گرنـگ هەنە ، وەك مەسەلەی (التزام) ، (بەیان) نەك هەر نەیتوانیوە ساغیان بکاتەوە و بەس ، بەڵـکوو نەیتوانیوە هەر باس کردن و گوفت و گۆ لەسەر کردنیشیان بخاتە کایەوە •

**وەڵامی پرسیاری چوارەم**

ئەوەی (بەیان) بۆ خزمەت کردنی ئەدەبی کوردی کردوویەتی لە بواری بڵاوکردنەوە و زیاندنـەوە و سـاغ کردنـەوەی کـەلەپووری کوردی دا ، لە بارەی گرنگی و نرخ لێ نانیەوە بە لای منەوە لە پلەی دووەمی خزمەتە گرنگەکانی دا دێ لە پاش خـزمەت کـردنی زمـانی کوردی وەك زمان ،کە لەمەوبەریش باسم کرد •

لەبەر ئەوەی زۆربەی کەلەپووری نەتەوایەتی کورد ، کۆمەڵایەتی و ئابووری و شتی دیی وەهایە کە زۆر پەیوەندی ڕاستە و خۆی بە باری ڕامیاری ئەم سەردەمەوە نییە ، گۆڤاری بەیان لە خزمـەت کردنـیدا درێغی کەمە ، دەقی زۆر لە بەندەکانی بـڵاوکردۆتـەوە ، لەسـەریان دواوە و هەنگاویشی ناوە بۆ ساغ کردنەوەیان • خۆزیا ئەو بەندانە شیان لە ( بەندنامە ) یەکدا کـۆ کردبایەوە و هـەر هەمان خۆزیام هـەیە بۆ کۆ کردنەوەی هەموو بابەتە کەلەپوورییەکانی دیکەش هەر بابـەتەی بەجیا • ئەمانە دەبوون بە توومارێ زۆر بە نرخ بۆ زانینی زۆر شـتی شاردراوەی گەلەکەمان •

**وەرامی پرسیاری پێنجەم**

لە پێش هەموو شتێکدا ، بەیانم دەوێ ، گۆڤارێکی کوردی ناوەڕۆک پوخت و بە پێزو شۆڕشگێڕانە و پڕ لە شتی بە کەڵک و جوان و خۆش بێ • بەشەکانی لە لایەن شارەزاو نێ زانەکانەوە هەلبژێردرابن • هیچ بەشێک لە هیچ ژمارەیەکدا نە خرابێتە پشت گوێوە ، بەشی زانیاری ، گۆشەی مندالان ، گولستانی‌شیعر ، بەشی چیرۆک ، ڕەخنە گرتن و •••••• هتد • هەتا وای لێ دێ زۆربەی خەلک بە گۆڤاری خۆی بزانێ • ئەمجا دەر هێنانێکی هونەری جوان • هەر بەشە بە پێی بەشەکە و ناوەرۆکەکەی • بەرگیشی بە نۆفسێت ، هەر جارە بەرگی پێشەوەی ، وێنەیەکی ڕوونی شاعیرێک ، ویژە وانێک ، هونەرمەندێک ، پیاو چاکێکی ناوداری کورد و بەرگی دواوەشی ، نیگارێکی جوانی سروشتی کوردستانی پێوە بێ •

**وەرامی پرسیاری شەشەم :**

گۆڤاری (بەیان) ، بەشداری یەکی باشی کردوە لە بلاوکردنەوەی زۆر لە ڕەخنەی ڕەخنە گرەکانمان • بەمە ، یارمەتی ڕەخنە لێگیراوەکانی داوە بە تێەڕ کردنیان و زال بوونیان بەسەر کەم و کوڕی‌یەکانیاندا و یارمەتی ڕەخنە گر و نیمچە ڕەخنە گرەکانیشی داوە بۆ گەشە کردن و پێگەیشتن و کامل بوون و یارمەتی خوێنەری داوە لە ڕووی بەرز کردنەوەی زانیاری گشتی‌یانەوە و لە دوایشدا یارمەتی وێژەی کوردی داوە کە بووە بە خاوەنی ڕەخنەیەکی ئەو تۆ کە دەتوانێ بلێ ڕەخنە و ڕەخنە گرم هەیە •

## با ئافرەتێکی پیرۆزی وون بوون کورد
## بە بیر خۆمان بهێنینەوە

بێوەژنێکی(٣٨) دەشتەکی ، لەپاش مردنی مێردەکەی تاکە کوڕێکی بۆ بەجێ دەمێنێ ، بەبێ سەردار و بێ کەس ، کە وادیارە لەو دێیەدا کە لەگەڵ مێردەکەی دا تێیداژیاوە ، لەپاش کۆچ کردنی ئەو ، لەبەر هەر هۆیەك بووبێ ژیانی بۆ هەڵنەسووڕابێ ، لە دەور و بەری سەد و شەست ساڵێك لەمەو بەردا ، ئەگەر کەل و پەلێکی ژیانی سادەی ئەو سەردەمەی ژیانی لادێی هەبووبێ ، شتێکی کەمی لەو شتە کەمە بۆ دەرچووبێیانێنا ، کۆی دەکاتەوە و بەلی کوڕەکەی دەگرێ و ڕوو لە شاری کۆیە دەکا .

ناوەڕۆکی ئەو بەڕێکرافەی سەرەوە بوختەی هەموو ئەوزانیاری‌یەیە کەلەبارەی «فاتێ»ی تۆمەر گومبەتی‌یەوە بۆ ئێمە بەجێ مابێ و زۆربەی ئەو سەرچاوانەی لە بارەیەوە نووسیویانە یەکدی گرن ، کە چۆن ئەوئافرەتە لە پاش مردنی مێردەکەی لە دێی « گۆڕ قەرەج »ی سەر بە ناحیەی «تەق تەق»ی ئێستاکەوە ، دەستی کوڕەکەی دەگرێ و لە کۆیە دەگیرسێتەوە .

هەر وەك ووتم ئەو ژنە ناوی «فاتێ» دەبێ و کوڕەکەشی . ئەو کەرەستە خاو و پاك و سادە بێ خەوشە دەبێ کە پاش ئەوەی دەستی

باش وەستای قارەمان دروست کەری کۆمەڵ و سروشت و ڕۆژگار ، بە هەموو لانەکانیەوە ، ئەرك و ئازاری چەوساندنەوە و زۆری لێ کردن ، بە هەموو شێوە کانیەوە ، دەیگاتێ و لەباش تێپەڕ بوونی ماوەیەك ئەمەنی پڕ لە کوێرەوەری‌یە سەری‌دا (حاجی قادری کۆیی) شاعیری یەکجار گەورەی کوردستانی لێ دروست دەکرێ • ئەو حاجی قادرەی کە بەسەربەرزی‌یەوە ، لەسەر کورسی یەکەمین شاعیری شۆڕشگێڕی نەتەوایەتی کورد ، لە ڕیزی هەرە پێشەوەی کەڵە شاعیرەکانی کوردستاندا ، دا دەنیشێ و هەموو شاعیر و بوێژ و خەباتکەرانی ئەم ڕێبازە ، سەری ڕێز گرتنی بۆ دا دەنەوێنن •

لەوانەی ئەو ئافرەتەیان بە بیردا هاتووە ، نە کەس دەزانێ ئەو «فاتێ» یە باوك و دایکی کێن • چۆن بە باوکی حاجی قادربڕاوە ؟ چەند منداڵی دیکەی بووە ؟ چۆن و بۆچی و لە کوێ مردوە ؟ لە کوێ نێژراوە ؟ لانەکانی دیکەی ژیانی چۆن بوون ؟

لە ناوەکەی «فاتێ = فاتمەی دایکی حاجی قادری کۆیی ، کە لە نیوەی نیو دێڕی ، شیعری حاجی خۆی دا ناوی هاتووە و لەوە خەڵکی (ئۆمەرمەندان = ئۆمەر گومبەت ) ە کە ئەمەش دەماو دەم هاتووە ، تا ئێستا دەرنەکەوتووە کەس هیچی دیکەی لە بارەیەوە بزانێ •

**باوکم ئەحمەد بوو ، ناوی فکرم دێ**
**خەڵکی لادێ بوو ، دایکی من (فاتێ)(*)**

من کە لەبارەی ئەم ئافرەتەوە دەنووسم ، بێ گومان تەنیا لەبەر ئەوە نی‌یە کە دایکی حاجی قادرە و وەکوو دایکێك هۆیەکی گرنگە لە بوونی حاجی قادر دا • ئەمە ئەگەر هەر لەبەر ئەم هۆیە بوایە ، دەبوو ئەم نووسینە «ئەحمەد»ی باوکی حاجی قادریش‌ی شان بە شانی

(*) دیوانی حاجی قادری کۆیی ـ چاپی هەولێر ١٩٦٩

ئەو بگرتایەنەوە • چونکە ئەویش هەر بەو بەرد و ترازووە ، لە
بوونی حاجی‌دا ، ئەگەر یەکەم کەسی دەست دار نەبووبێ ، دووەم کەس
هەر بووە • یان بە تایبەتی لەبەر ئەوەنی‌یە کە دەستێکی بالای هەبووە
لە ڕاست و چاك پەروەردە کردنی حاجی و پاراستنی لە پێوە نووسانی
دڕکی خوو ڕەوشتی بێ کەڵك و ئازار بەخش ، لەگەڵ هەموو
گرنگی‌یەکی ئەم لایەنەشەوە ، لە داڕشتنی کەسایەتی حاجی قادر دا ،
ئەمە بە پێی ئەو قسەیەی کە باوە و دەڵێ : « دایك یەکەمین قوتابخانەی
مرۆڤە ، » ئەگەر تەنیا بۆ ئەم هۆیەش بێ ، دیسان باوکی حاجیش
مافی باس کردنی هەیە و نابێ بخرێتە پشت گوێوە • چونکە باوکی
حاجی ، وەك لە دێڕە شیعرەکەی سەرەوەی دا دەر دەکەوێ ، تا ئەو
تەمەنەی حاجی ژیاوە ، کە چاجی تێدا گەیشتووەتە ڕادەیەکی وەها
کە شتی لەبیربمێنێ ، پاش ئەوە ئەو جا مردووە • مانای وایە لە داڕشتنی
بەردی بناغەی کەسایەتی و پتەوی و توند و تۆڵی حاجی دا ، لەلایەن
خوو ڕەووشتەوە ، دەستێکی هەر هەبووە •

ئەگەر هەر بۆ ئەم دوو هۆیەبێ ، بۆ چی زیاد لە دایکی هەموو
شاعیرە مەزنەکانی دیکەی کوردستان ، دەبێ دایکی حاجی هەڵبژێرم و
لەسەری بنووسم • خۆ دایکی ئەوانیش ، لەوانەیە بە هەمان
فەرمانی سروشتی و کۆمەڵایەتی هەڵساۆن ، یاهەڵسابن •

بەر لەوەی ئەو هۆیە دەربڕم کە هەر نەبێ ، بەلای منەوە گرنگە و
پێویست دەکا سەرنجی خەڵك و نەتەوەی کوردی بۆ ڕابکێشرێ ، با
جارێ پرسیارێك لە خۆمان بکەین و لە دووایشدا هەوڵ بدەین هەر
خۆمان وەرامی خۆمان بدەینەوە • پرسیارەکەش ئەمەیە :ـ

چی دەبوو ، ئەگەر فاتمی دایکی حاجی ، حاجی قادری کۆیی

نەخستبایە بەر خوێندن ؟ وا بزانم کەس نەبێ لەسەر ڕەوایی و بەجێ‌یی ئەم پرسیارەگەلەیی هەبێ ، بە تایبەتی ئەگەر باری دارایی و کۆمەڵایەتی دایکی حاجی ، بە تێڕوانینێکی ئاسایی ، نەك بە ووردی بهێنینە بەرچاو.

بێوەژنێکی دەستەکی ، تاکە کوڕێکی هەبووبێ و لەبەر هەر هۆیەك بووبێ ، سەدو شەست ساڵ لەمەوبەر دێ‌یەکەی ماڵ و مێردی بەجێ هێشتبێ و ڕووی لە شار کردبێ . زۆر ئاسایی و سروشتی دەبوو ، کە هەر پاش ئەوەی جێی تێدا ستار بوونی لە شارەکەدا دەست کەوتبێ،ڕۆژی دوایی ، دەستی کوڕەکەی گرتبایە و چارشەوی(٣٩) بە خۆی دا بدایا و بەسەر گوزەرە پیشەسازی‌یە جیا جیاکانی بازاری کۆیەدا بسووڕابایەوە و لەلای وەستا کارێك‌دا بیکر دبایە شاگرد . لە سەرێکەوە بۆ یارمەتی دانێکی خۆی کە ژیانی ڕۆژانەی خۆی و کوڕەکەی وە دەست بهێنێ ، لە سەرێکی دیکەشەوە بۆ دابین کردنی دوا ڕۆژێکی وەك خەڵکی ئەو سەردەمە بۆ کوڕەکەی . کوڕ لەو سەردەمەش دا یان دەبوو سنعەتکاری فێر ببێ ، کە ئەمەیان ئاسایی تر بوو ، ئەو کاتە ووتراوە ، (سنعەتکار بازنی زێڕی لە دەست دایە)(٤٠) واتە هەرگیز داماوی و پەك کەوتەیی و نەبوونی بە چاوی خۆی نابینێ. یان دەبوو بخرێتە حوجرە و بخوێنێ کە ئەمەیان کەمتر و دەگمەن بووە.

ئەگەر ئەمە وەهابایە ، ئێمەی نەوە و پیاوی ئەم سەردەمە ، لەگەڵ حیساب کردنێکیش دا بۆ زیرەکی حاجی قادر ، کە وەها دابنێین لە کۆڕی پیشە سازی‌دا هەر زیرەك‌بوایە ، ناوی (وەستا حاجی قادری دارتاش) یان (وەستا حاجی قادری باش جۆڵا ) یان .... هتد مان بۆ بەجێ دەما . وە لەبەر کۆنتری‌یەکەی ، وەستا حاجی قادر هەندێ لە (وەستا ڕەجەبی تۆپچی ڕەواندزی)بە ناو بانگتر دەبوو . وە بۆ

مۆزەخانەی یەکێک لە شارەکانمان ، کۆنە داس ، کۆنە گاسنێکی دەسکردی وەستا حاجی قادری ئاسنگەر ، یان خەنجەرێکی جەوهەر داری زەنگاوی لە دەسکردی وەستا حاجی قادری شیرگەرمان بۆ دەمایەوە .

بۆ ساغ کردنەوەی ئەو ڕاستییەش کە « فاتم » ی دایکی حاجی قادر هەژار و نە دارا بووە ، ئەم دوو سێ خەتەهۆنراوەیەی حاجی خۆی بەسن کە بکرێن بە بەڵگە ، کە لە پاش ئەوەی بووە بە پیاو و بووژاوەتەوە ووتوونی . بێ گومان هەر چۆنی لێك بدەینەوە ، هەر دەبێ ژیانی ئەو کاتەی حاجی قادری پیاو و شاعیر خۆشتر بووبێ ، لە ژیانی حاجی بە منداڵی و لە ژیانی دایکی لە کاتێکدا دایکی حاجی خۆی و حاجی بە خێوکردووە وە دەبێ حاجیش لە دایکی دارا تر و دەست ڕۆیشوو تر بووبێ .

حاجی لە نامەیەکیدا ، کە بۆ دۆستێکی نووسیوە و بۆ کۆیەی ناردوە . بە دۆستەکەی دەڵێ :ـ

**وە بیرت دێ زەمانێ چوینە باڵەك .**
**بەپێ خاوسی ، نە کەوشم بوو ، نە کاڵەك ؟(٤١)**

بە فەقێیەتی ، هەر لە کۆیەوە هەتا باڵەکایەتی کە ناوچەیەکە لە نێوان ڕەواندزو حاجی ئۆمەراندایە ، بەبێ پێلاو ڕۆیشتووە کە بە حیسابی جاران سێ ڕۆژ ڕێیە و بایی کڕینی جووتی پێڵاوی لە دەست دا نەبووە . لە جێگایەکی دیکەدا دەڵێ

**هەر منم ئێستا وارثی عیسا**
**بێ کوڕ و ماڵ و بێژن و مەئوا(٤٢)**

دوا نموونەم لەسەر هەزاری حاجی قادری شاعیر و پیاو لە ناو شیعرەکانی دیکەیدا ئەمەیە

**سەعدی ایبامی خۆی نەبوو نانی**
**وەکوو من بوو ، گەڕۆك و بێ خانی(٤٣)**

جا ئەگەر حاجی بە گەورەیی و بە شاعیری ئەمە باری ئابووری و ژیانی دارایی بووبێ ، ئەدی دەبێ بە هەتیوی ، یان دەبێ دایکی حالی چۆن بووبێ ؟

یەکێك لە نووسەرەکان(٤٤) کە زۆر خۆی بە حاجی قادرەوە ماندوو کردووە ـ وەك لە بیرم مابێ ـ شتێکی وەهای لە بارەیەوە گوتووە ، کە حاجی قادر لەسەر دەمی فەقێیەتیدا ، شاگردیی کەوش دوورویی کردبێت و ئەم ئیش‌کردنە وای لە حاجی کردبێ هەندێ لە خوێندن دوابکەوێ • کە ئەمە بە شێوەیەکی نا ڕاستە و خۆ بەلگەیە لەسەر نە دارایی دایکی حاجیی ، کە ئەمەندەی نەبووە کوڕەکەی پێی بخوێنێ ، ئەمە لەسەر دەمی ژیانی دا ، وە ئەمەندەی نەبووە بۆ کوڕەکەی بەجێ هێشتبێ کە خوێندنەکەی پێ تەواو بکا • ئەگەر لە کاتی ئیش کردنی حاجیدا ، دایکی نەمابێ •

با لێرەدا بەشی دووەی وەرامەکە بدەمەوە • یان با بڵێم وەرامدانەوەی پرسیارەکە کۆتایی پێبێنم :

ئەگەر (فاتێ)ی دایکی حاجی قادری کۆیی ، بە منداڵی حاجی قادری بخستبایە بەر فێر بوونی پیشە سازی و کاسپی پێ بکردایە و حاجی فێری خوێندەواری نەبایە ، ئێمە ئیمڕۆ (باش وەستا حاجی قادر)مان دەبوو •

زۆربەی ئەمەن و ژیانی لە دروست کردنی ئەو بەرهەمــە دا بــە سەر دەبرد کە بەپێی شارەزایی ئەو سەردەمە ، حاجی پسپۆڕیی تێـدا پەیدا دەکرد . بە فرۆشتنی ئەو بەرهــەمە ، بە کڕینی کەرەستەکانی کە لە دروست کردنی ئەو بەرهەمەدا بە کار دەهێنران . ئەگەر دەرفەتێکیشی دەست بــکەوتایە ، خەریکی ماڵ پێــکەوەنان و منداڵ پەروەردە کردن دەبوو . وەك هەزاران باش وەستای ئەو سەردەمە ، ئاگای لــە ژیانی نا لەباری گەلەکەی و باری ژێردەستی و دوواکەوتەیی نیشتمانەکەی نە دەبوو . بەم جۆرە دەژیا ، هەتا بۆ دواجار سەری دەنایەوە .

ئەگــەر کەسانێك هەبن و بڵێن کــە تەنانەت لەوبارەشدا ، لەوانە بوو کــە حاجی شتێك لە وورییایی و ڕووناکی بــکەوتایەتە مێشکــەوە و ئێمەش ئەمەیان بۆ بسەلمێنین کە وەهایە ، دیسان دەڵێم :

هەر چۆنێ با ، ئێمــە ئیمرۆ ، حاجی قادری کۆیی ، کەڵە شاعیری پێشەوا و مامۆستای شاعیرانی شۆڕشگێڕی نەتەوایەتیمان نە دەبوو . وە لە جیاتی ئەو سەدان گلۆپە گەشەی لە میراتی ئەوەوە بۆمان بەجێ ماوە ، کــە هەر دێڕە هۆنراوەیەکی یەکێکە لەو گلۆپانە و ژیانی ســەردەمی خــۆی و ڕێبــازی نەتەوایەتی و شۆڕشگێڕیەتی و بــگرە تا ڕادەیەکی باشیش ڕێبــازی ئەوەی پێشــان داوین کــە پشت بە شوان و گاوان و سەپان و ئیشکەران ببەستین ، دەڵێم لە جیــاتی ئەوانە ، ئێستە پارچــە ئاسنێك یان پێشکەیەکی جوان ، یان تۆپێکی کە بە پەڕۆپنەقێندرێ ، یان هــەر شتێکی دیکەی لەم چەشنەمان ، لە یەکێك لە مۆزەخانەکاندا لــە حاجی یەوە بۆ دەمایەوە . ئەمەش ئەگــەر بمابایەوە .

لەو سێ چاکە یە گەورەیەی «فاتم» ی دایکی حاجی کــە بەسەر حاجی کوڕی یەوە هەیەتی ، یان هەی بووە ، (دایکایەتی ی ـ پەروەردە

کردنی بە خوو ڕەووشتی باش و بەکەڵك و جوان ـ خستنە بەر خوێندنی ) ، ئەمەی دوایی یان ، هەر چەندە بە پلە و بە قۆناغ لەپاش دوو پلەکەی پێش خۆی دادێ ، بەڵام لە گرنگی دا تا ئەو ڕادەیەی پێوەندی بە گەل و نیشتمانی کورد و بە حاجی خۆشیەوە هەیە ، ئەم چاکەیەیان پێش ئەوانی دیی دەکەوێتەوە •

ڕاستە وەکوو هەموو ئەو ئافرەتانەی دیکەی گێتی «فاتم»ی دایکی وەکوو دەڵێن «حاجی بە چەرمی زگ هەڵگرتووە» و پەروەردەیەکی باش و ڕاست و بە کەلکیشی کردووە ، ئەگەر نەیخستبایە بەر خوێندنەوە ، بەرهەمی ئەو دوو چاکەیە ، ئەم بەرهەمە بە پیت و بە پێز و فەڕە نەدەبوو • ئەم هەنگاوەی «فاتێ»ی دایکی حاجی قادر ، هۆیەکەی ئایا دوور بینی ئەو ئافرەتە بووبێ ، یان بێ تەماحی و لە خۆ بووردوویی ، یان لەوەوە هاتبێ کە حەزی کرد بێ کوڕەکەی لە جیاتی خۆی فێری خوێندنی ئاینی و دونیایی بێ ، یان هەر هۆیەکی دیی بووبێ • لە ناو هەموو ئەو شتانەی بوونەتە هۆی پێگەیاندن و گەیشتنی حاجی قادر بەو پلەیەی کە پێی گەیشت ، باشترین و بە کەڵك ترین و پیرۆز ترین شت بووە • ئەمە نەبایە ، حاجی قادری کۆیی هەرگیز نە دەبوو بەو کەڵە ، نەمرە ، قارەمانە ، ڕاست گۆیە شاعیرە •

ئەو نووسەرەی لەمەو بەر پەنجەم بۆ یەکێك لە ووتەکانی درێژ کرد (٤٩) هەوڵێکی زۆری داوە بۆ ئەوەی کە هۆی سەرەکیی لە درووست بوونی حاجی قادری کۆییدا ، بەو چۆنیەتییەی کە هەیە ، بداتە پاڵ چاکە لەگەڵ کردن و یارمەتی دانی بابیرانی و بنەماڵەی خۆیان بۆ حاجی قادر •

ئەو نووسەرە بەو لایە دا هەر نەچووە کە « فاتم »ی دایکی حاجی قادر هەر نەبێ دوو هەنگاوی هەوەڵی و سەرەتایی کە گرنگترین هەنگاون لە دروست بوونی حاجی دا ، ئەو هاویشتوونی کە یەکەمیان پەروەردە کردنی حاجی بووە بەو خوو ڕەووشتە بەرز و پیرۆزە قووڵ و پڕ لە خۆ بەخت کردن و ئازایەتی‌یە کە لە ناوەرۆکی هۆنراوەکانی دا دەی بینین‌و هەستی پێ دەکەین و دووەمیشیان حاجی‌خستنە بەر خوێندن و بە حاجی خوێندنە ، کە بەبێ هاویشتنی ئەم دوو هەنگاوە ، کە ئەمە تەنیا هەر بەو ئافرەتە دەکرا و کردوویەتی ، بە تایبەتی هەنگاوی دوایی یان ، حاجی نەدەبوو بەم حاجی‌یە مرۆڤ و هەستیار و شاعیر و زیر و شۆڕشگێڕە .

قسەی ئەو نووسەرە ، بۆ گەڕانەوەی هۆی سەرەکی لە پێگەیشتنی حاجی قادر دا بۆ بنەماڵەی خۆی ، قسە و بۆچوونەکانی ، وانەبن ، یان وەهابن ، کە ئێرە جێگەی ساغ کردنەوەی ئەم چەند و چوونە نی‌یە،بەڵام با تەنیا بۆ خاتری ئەو بڵێین وایە و کراوە و تەواوە ، لەگەڵ ئەمەشدا ، گرنگی ئەو یارمەتی و چاکی‌یە ، لە گرنگی و کاریگەری دا لە دوای ئەم هەنگاوەی دوایی « فاتم »ی دایکی حاجی قادر دا دێ .

وە نەبێ تەنیا هەر ئەو نووسەرە لەم مافەی « فاتێ »ی دایکی حاجی قادری چاو پۆشی کردبێ . بەڵکوو هیچ نووسەرێکی دیکەش بەلای دا نەچووە . بەڵام ئەمیان لەبەرئەوەی نووسینەکەی لەسەر حاجی زۆر دور و درێژە ، لەم لایەنەوە زیاتر شایانی گلەیی لێ کردنە . چونکە گەلێ شتی زۆر وورد و نا گرنگی شی‌ی کردۆتەوە و دوو بارە و چەند بارەی کردونەتەوە . کەچی بۆ باس کردنی مافی ئەم ئافرەتە و ڕۆڵە مێژوویی‌یەکەی لە دروست بوونی حاجی قادر دا ، هەر وەك ئەوە کە نەبووبێ و سفری لە دوای فاریزە بووبێ ، خۆی لێ بێ دەنگ کردووە .

« فاتی » جگە لەوەی کە دایکی حاجی بووە ، ماوەیەکی باشیش لە جێگەی باوکیشی بووە ، لەم ڕووەشەوە چاکی یەکەی بە سەرمانەوە زیاتر بووە لەوەی کە لەمەوبەر ووتمان •

تا ئەمڕۆ ، تا بڵاو کردنەوەی ئەم ووتارە کورتە ، هەموولایەکمان ، بە گشتی کەمتەر خەمیمان کردوە لەوەدا کە ئەو ئافرەتە پیرۆزە مافی خۆی نە دراوەتێ • هیوادارم ئەم چەند دێرە ، یەکەم ڕێز لێنانی بێ و دوایی نەبێ وە لە دوا ڕۆژدا لە ناو ئافرەتانی کوردستان دا ، جێگەیەکی دیار و بەرز و شیاوی بۆ تەرخان بکرێ و لە ڕۆژە مێژوویی‌یەکانی ئەدەبی کوردیشدا بەشی‌ی خۆی بدرێتێ •

**سلێمانی ٨ / ئادار / ١٩٨٤**

# پەراوێزەکان :

١ ـ ( پێشنیاز ) ڕاستە ٠ ( نیاز ) دەخرێتە پێشەوە ٠

٢ ـ ( وێژە ) ڕاستە ٠

٣ ـ عبدالرزاق بیمار

٤ ـ قوتابخانەی سەرەتایی ٠

٥ ـ زمان ٠٠٠ جاران ( زوبان )یش بەکار دەهات [ زوبانی حاڵی ئەحمەد هەر ئەڵێ ووریا بە ئـەی میللەت ـ بزانن بەردی ئـەم شاخانە ئەڵماس‌و گوهەرتانە ] ـ ئەحمەد بەگی صاحبقران

٦ ـ هەش = خوم ٠

٧ ـ کزنگی هەتاو ـ خالید دلێر ـ ١٩٥٧ ـ چاپخانەی ترقی ـ کەرکووك٠

٨ ـ نشرت الجزء الاعظم من هذا الفصل من القصـيدة ضمن مجموعـتي الشعرية الثانية المسماة ( بەرەو لووتکەی ئاوات ـ نحو قمة الاماني ـ ١٩٧٩ ـ مطبعة جامعة السليمانية ٠

٩ ـ هەتا پەراوێزی ژمارە (١٩)ەش ـ قسەی پێشینانن

٢٠ـ قراءة في ـ بەرەو لووتکەی ئاوات ـ نحو قمة الاماني ـ كمال غمبار ـ جريدة العراق ـ العدد/ ١٠٨٥ ـ الصفحة الثالثة ـ يوم الخميس ـ ٢٠ / ايلول / ١٩٧٩ ٠

٢١ـ شیعری تاهیر بەگی جاف ٠

٢٢ـساڵی لە دایك بوونی [دیوانی حاجی قادری کۆیی ـچاپی سێیەمین ـ چاپخانەی کوردستان ـ هەولێر ـ ١٩٦٩ ـ ل ٣
ساڵی کۆچ کردنی [ تێگەیشتنی ڕاستی ـ شوێنی لە ڕۆژنامە نووسی کوردیدا ـ د ٠ کەمال مەزهەر ـ چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ـ بەغدا / ١٩٧٨ ]

٢٣ـ دیوانی حاجی قادری کۆیی ـ ل ٨٢ ـ سەرچاوەی پێشوو

٢٤ـ بەرەواژ = کورت کراوەی ( بەرە و ئاوەژوو )ە ٠

٢٥ـ ئەنجومەنی ئەدیبان ـ ل ٢٣ ـ ئەمینی فەیضی ـ چاپخانەی کـۆڕی

زانیاری عیراق ـ بەغدا / ١٩٨٣

٢٦ـ تێگەیشتنی ڕاستی ـ سەرچاوەی پێشوو ـ ل(١٠٨)

٢٧ـ گۆڤاری شەفەق ـ ژمارەیەك ـ سالی یەکەم ـ ١٥ی کانوونی دووەم / ١٩٥٨ کە لە کەرکوك دەردەچوو ٠

٢٨ـ گۆڤاری شەفەق ـ ژمارە پێنج و شەش ـ سالی یەکەم ـ مایس و حەزیران / ١٩٥٨

٢٩ـ مێژووی ئەدەبی کوردی ـ ل ٣٧٤ ـ چاپی دووەم ـ علاء الدين سجادی ـ بەغدا / ١٩٧١ ٠

٣٠ـ مێژووی ئەدەبی کوردی ـ چاپی دووەم ـ علا الدين سجادی بەغدا / ١٩٧١ ٠

٣١ـ دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی ـ چاپخانەی مەریوان ـ بەغدا / ١٩٣٥

٣٢ـ دیان = مەسیحی ، ( ئاسوری ) یەکان یا خود ( تیاری ) یەکان کە بەشێکن لە دیانەکان ( فەلە ) شیان پێ دەلێن

٣٣ـ پاسەوانی شەوان

٣٤ـ جاران شیری میسریٚ بە ناو بانگ بووە ـ ووتراوە زمانی دەلێی شیری میسرە ناچێتەوە کالانیٚ٠ئەو جا گۆرانیە کە لە (شا میسری) مەبەستی شای ئەو شمشێرانەبووە بەم بۆنەیەوە با لێرەدا ئەم تێبینیەش بخەمە بەر چاو :ـ جاران کە بە هۆی کەمی تێگەیشتنی خەلك و قۆناغی مێژوویی دەرەبەگایەتی و نیمچە دەرەبەگایەتی ئەو سەردەمەی کوردستان ـ ( شایەتی ) ( سولتانیەتی ) کە لووتکەی دەسەلاٰت داریەتی و چەوساندنەوەی خەلك بوون لە کوردستان دا باویان هەبووەو بە چاوی گەورەیی ئەو سەردەمەوە سەیریان کراوەو ئەمە لە ئەدەبەکەشمان دا بەم شێوەیە باس کراوە لەم ڕۆژگارەدا (سولتانیەتی)یەکە نەماوە بەلاٰم ( شایەتی ) یەکە لەم سەردەمەشدا ، سەردەمی ڕاپەڕینی گەلانی ئازادیخواز و بەرەوهەلدێر ڕۆیشتنی ئیمپریالیزم ، جار و بار لە وێژەکەمان دا هەر سەر بەرز دەکاتەوە!٠

٣٥ـ گولە سمەر = کورتکراوەی ( کول ئەسمەر )٠

٣٦ـ ئەوی نێوان کەوانەکە ، لە شریتە تۆمارکراوەکەی لێم وەرگرتووە بۆم ساغ نەبۆوە کەچییە ٠

٣٧ـ وەکوو لە بەیتەکەدا دەر دەکەوێ ، دەبێ ئەو (ووسووی مووغانیی)یە جوولەکە بووبێ و کابرایە کی دەوڵەمەند بووبێ و یەکێك بووبێ لە دەستەڵات دارەکانی دارایی ئەو میرنشینە ، یان ئەو ناوچەیە ، ئەمە ئەگەر ئەفسانە کە هیچ پەیوەندیەکی بە ڕاستییەوە بووبێ

٣٨ـ بۆچی «بێوە مێرد» نەبێ کە لە «بێمێرد» وە نزیکە و پیـاوی ژن مردووش «بێوە ژن» نەبێ ، کە لە «بێژن» ە وە نزیکە ؟! پرسیارێکە ئاراستەی ئەو کەسانەی دەکەم کە پسپۆڕی زمانەوانی کوردین

٣٩ـ چار شەو = چار شێو = قوماشێکی ئەستووری ڕەش ، لە جیاتی عەبا ، جاران ، ژنە کۆییەو ٠٠٠ هتد بۆ خۆ داپۆشین بەکـــاریان دەهێنا ٠

٤٠ـ قسەیەکی پێشینانی ناوچەی کۆیەیە ٠

٤١ـ کارەك ـ بە شێوە زمانی کۆیە ٠ چەشنە پێلاوێکە لـــە پێستی ئەستوور و دەزو و ئاوریشم دروست دەکرێ ٠ جاران یەکێك بوو لەو پیشە سازییانەی کە لە کۆیە پێشکەوتوو بوو ٠ پیـــاوان بۆ دەرەوەی ماڵ لە پێیان دەکرد ٠ ئێستا زۆر کەم بووەتەوە ٠ شیعرە کە لە دیوانی حاجی قادری کۆیی ـ چاپخانەی کوردستان ـ هەولێر ١٩٦٩

٤٢ـ سەرچاوەی پێشوو

٤٣ـ سەرچاوەی پێشوو

٤٤ـ مەبەستم (مەسعوود محەمەد)ە

## « سوپاس »

کاك ( حەویز بەکر ئەمین چاوشین) ی خاڵۆزام
بە دەست قەرز پارەی چاپکردنی ئەم کتێبەی
داوەتێ ، سوپاسی دەکەم •

لە کتێبخانەی نیشتمانیدا ژمارە (١٤٣٩)ی ساڵی
(١٩٨٥)ی دراوەتێ